# ژياننامەی کچەکانی پێغەمبەر

(ڕەزای خوايان لەسەربێت)





وەرگێڕان و ئامادەکردنی
فەرهاد گۆمەشينی

چاپی دووەم/ ٢٠١٠

# ژياننامەی کچانی پێغەمبەر

## (ڕەزای خوایان لەسەربێت)

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

**فەرهاد گۆمەشینی**

**چاپی دووەم / ٢٠١٠**

ناوی کتێب/ ژیاننامەی کچەکانی پێغەمبەر (ڕەزای خوایان لەسەر بێت)

بابەت/ ژیاننامە

وەرگێڕان و ئامادەکردنی: فەرهاد گۆمەشینی

پێداچوونەوەی: عبداللطیف یاسین و حەوێز حاجی عەلی.

دیزاین/ نووسینگەی مریوان گرافیك

پیت چنین: شمس الدین عزیز عبدالله.

تیراژ/ ١٠٠٠ دانە

نۆرەی چاپ/ دووەم

ساڵی چاپ (٢٠١٠)

چاپخانەی شەهاب ـ هەولێر

ژمارەی سپاردن: (١٧٧٧) ی ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ

# ناوەرۆك

# دەستپێك

بەناوی خودای گەورەومیهرەبان

درودوسەلامی خودا لە پێغەمبەرمان (محمد) (صلى الله علیه وسلم) وە لە یارویاوەران وپەیڕەوانی ئەم ئایینە پاکە،وە لەکچانی پێغەمبەروگشت ئافرەتانی پاك وئازا و رەوشت بەرز،وە لەوئافرەتانەی لەرێگای ئەم ئایینە ئازاریان چەشتووە وئارامگربوون ،خوا لە گوناهی هەموویان خۆش بێت .

بەهۆی نەبوون یاخود کەمی نوسین بەزمانی کوردی ، دەربارەی خانەوادەی پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) بەپێویستم زانی ئەم کتێبە بخەمە بەردەستی خوێنەری کورد .بۆئەوەی شارەزایمان هەبێ دەربارەی ژیان وگوزەرانیان ، بەتایبەت ئافرەتانمان بۆئە وەی لەسەرخوڕەوشتی (زەینەب و روقیە وئوم کەلسوم وفاتیمە) بڕۆن و پەیڕەویبکەن،وەك ئەوان ئارامگروئازا بن ، بەرامبەردوژمنان وناخۆشی یەکانی ژیان . هیوادارم ئەم کتێبە سودی زۆری هەبێ بۆمان .

چاپی یەکەمی ئەم کتێبە لەلایەن (ماڵپەڕی پێغەمبەر)و(پرۆژەی وەفا/ لەدەنگی یەکگرتوو رادیۆی هەولێر بەهاوکاری خێرخوازان

(۲۰۰۰) دانەی لێ چاپکراو لە ڕێگای بەخشینەوە دابەش کرا ، سوپاس بۆهەموو ئەوانەی هاوکاروهۆکاربوون ، بۆبەچاپ گەیاندنی .

چاپی یەکەمی دوای تایپکردن واتە پێش چاپ نەگەیشتەوە دەستم بۆیە هەڵەوکەم وکوڕی زۆری تێکەوتبوو ، لەم چاپە هەوڵی زۆرماندا بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکان ، داوای لێبووردن لە خوێنەر دەکەین .

## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحیم ..

الحمدلله والصلاة والسلام علی سید الخلق محمد وعلی آله وصحبه ومن والاه، ئەم کتێبە تایبەتە بە باسکردنی خانەوادەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەتایبەتی کچەکانی خۆشەویست:

لەسەرەتادا باس لەکێشەیەك دەکەین، وەك پێشەکییەك بۆناو بابەتەکە . مەبەستمانە کێشەکە بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە، ئەویش باسی ئەو خاڵە گرنگانەیە کە پێویستە بیزانین.

زۆربەمان گوێمان لە باسی ژیاننامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە، لە وتارەکانی رۆژانی هەینی یان لە بابەتی مامۆستایان، لە باس کردنی ژیاننامەی ئەم خانەوادە بەرێزە. بۆیە ئەوانەی کە زۆر دووبارە کرایتەوەو زۆر قسەی لەسەر کرایە زۆرناپرژێینە سەریان، تەنها دێینە سەر ئەو لایەنەی کە مەبەستمانە باسی بکەین، ئەو لایەنەی کە کەمتر قسەی لەسەر کرایەو کەمتر بەر گوێمان کەوتووە، ئەویش باسکردنی ژیانی ناو خانەوادەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) هەر لەسەرەتای پێکهێنانی یەکەم هاوسەرگیری خۆی ، ئەویش (خەدیجە) بوو، (رەزای خوای لێبێت) دواتر خێزانەکانی دیکەی ، دواتر منداڵەکانی ..وە چۆنیەتی مامەڵەکردنی خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ منداڵەکانیدا.

قسەکردن لەسەر ئەو رۆژگارە کارێکی ئاسان نییە ، چونکە کۆمەڵێ دەنگوباس هەڵدەگرێ. تا ئێستا زۆرجار زانایان خۆیان لەم باسە دەپارێزن و زۆریش لە زانایان نەهیان کردیە ، زۆر بە ووردی ئەو لایەنە باس بکرێ ، بەتایبەت بنەماڵەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ، زانایان بەجۆرێك قسەیان لەسەرکردووە ، مرۆڤ زۆر نەچێتە ئەو لایەنەو خۆی پێوە سەرقاڵ نەکات..!! بەلام خۆ دوورگرتن یان باس نەکردنی شتێکە ناکرێ مرۆڤ بە تایبەتی موسڵمان شتی دەربارەی نەخوێنێتەوەو دەربارەی زانستی پێ نەبێت، لەبەر ئەوەی قورئان لەو کاتە هاتۆتە خوارەوە و لەو سەردەمدا قسەی لەگەڵ خەڵکدا کردووە ، ئەوکاتە نەوەیەك دروستبوو قورئانیان لەبەر کردو کردیانە یاسای ژیانیان ، رۆژانە کاریان پێکرد. بەڕاستی ئەو نەوەیە رۆژانە هەڵس و کەوتیان پابەند بوو بە قورئانەوە ، ئەوان کە بەیانیان لەخەو هەڵدەستان چاوەڕێی هاتنی پەیامی نوێ بوون، کاتێك نیوەڕۆیان بەسەردا هاتووە ، یاخود بەهەمان شێوە کاتی عەسرو مەغریب و عیشایان بەسەردا هاتووە.. هەمیشە لە ئامادەباشیدا بوونە، کە خوای گەورە چییان پێ دەفەرمووێت و چییان پێ دەڵێت، لەم قۆناغەدا و چۆن فەرمایشتیان دەکات ؟! وە چۆن قسەیان لەگەڵدا دەکات و بەرەو کام لا ئاراستەیان دەکات..!! ئەگەر سەیری قورئانی پیرۆز بکەین بێگومان بچوکترین هەڵەی تێدا بەدیی نەکراوەو ناکرێت ، بەلام

کاتێك کە دەڕوانینە ژیانی پێغەمبەر (صـلی الله علیـه وسـلم) لەگـەڵ هاوەڵانیدا بەگشتی دەبینین جیاوازی هەیە ، قورئان کە پەیامی خودایە ، بریتییە لەو شتەی کە خوای گەورە ناردیتییە خـوارەوە، بـۆ مرۆڤـ. هەرچی ژیانی مرۆڤیشە بە دەر نییە لەهەڵە وکەم وکوڕی، قورئـان بـۆ ئەوە هاتووە، تاکو هەڵەی مرۆڤەکان ڕاست بکاتـەوە ، وە ڕێنومایيـان بکات بەرەو چاکە .

خانەوادەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نزیکترین کەس بـوون لـەخودی پێغەمبـەرەوە (صـلی الله علیـه وسـلم) کەواتـە نـزیکترین کەسیش بوونە، لە سەرچاوەی پەیامی ئاسمانی ،کـە بەسـەر پێغەمبـەردا دادەبەزی ، بۆ نموونە: قورئانی پیرۆز لـە ژووری (عائیـشە ، حەفـسە) هاتۆتـە خـوارەوە بـۆ پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) . دواتـر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەناو ژوورەکەی عائیـشەدا نێژرایـە ، ئەو شتانە وامان لێ دەکاتن، ئەگەر ئێمە نەپرژێینە سەریان و زانیاریەکی باشمان نەبێتن ،کۆمەڵێك پرسیار لامان دروست دەبێت ، دەتوانین بڵێین وەڵامیان نییە . باشە قورئان بۆئـەوە هاتۆتـە خـوارەوە کـە مـن کـاری پێبکەم و جێبەجێی بکەم؟ لە ژیـانی خۆمـدا، ئـەی چـۆن دەیکـەم ؟! ئەگەر شارەزاییم لـە قورئان و ئەو ژینگەیەدا نەبێت، کـە تێیـدا هاتۆتـە خوارەوە؟! . قورئان تایبەت وتەنها بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نە هاتوتە خوارەوە ، بەڵکو بۆمن وتۆی بەنـدە وگـشت مرۆڤایەتییـە ،

ئەو وەك پێغەمبــەرێك و نێردراوێـك ئـەم دوا پەیامـەی گەیانـدووە بـە مرۆڤەكان ، ئێمە لـەم نامیلكەیەدا چەند تێبینیەكی گـرنگ هەیـە باسـی دەكەین، بە ئومێدی ئەوەی بتوانین لـە ئایندەدا زانیاری زیاتر لەبارەیەوە بخەینە ڕوو. ئەوەی گرنگە لێرەدا لامان روون و ئاشكرا بێت ، دەبێت بە بوێرییەوە باسی بكەین ، وەك ئەمانەی خوارەوە:

١- جیاوازییەك هەیە لەنێوان نیگا(وحی) و مێژوو (تاریخ)دا.

(نیگا ) ئەو شتەیە: كە لەلایەن خوای گەورەوە هاتۆتە خـوارەوە ، جێگای دەستكاری نییە ، فەرمانەو لای خوداوە دابەزیوە. ( مێـژوو)ش بریتیە: لەو زانستەی كە ژیانی مرۆڤەكانی تۆمار كردووە ، بـۆ نموونـە ژیانی هاوەلانی پێغەمبەر (صلی الله علیـە وسـلـم)كـە لەوسـەردەمەدا ژیاون ، بریتییە لـە سـەرەتای دروسـتبوونی مێـژووی ئیـسلامی ، بۆیـە دەبێت زۆر بە وردی مامەڵەی لەگەڵدا بكەین.

ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك قورئان گەیاندویـەتی لەگەڵ ئـەوەی دواتـر كـە ژیـانی هاوەلانـە و پاشـتر روویـداوە ، لــە هەڵوێستێكی خێزانیی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بگرە تا هەر هەڵوێـستێكی تـری موسـڵمانان، دەبێـت بـزانین ئـەوە هەڵوێـستی مرۆڤەكانە ، نەوەك (وحی)، چـونكە خانـەوادەی پێغەمبـەر (صـلی الله علیه وسلم) بەگشتی مرۆڤن . ئەوەتا هەر مامی پێغەمبـەرە (صـلی الله علیه وسلم) نكۆڵی لەبوونی خوداو ئاینەكەیدا دەكات ، ئەویش (ابو

لهب)ه، وه (ابو طالب) لەو ساتەی کۆچی دوایی دەکات ئیمان بە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ناهێنێت ، لەگەڵ ئەوەشدا پشتیوانێکی باشی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو ، بەلاّم ئەم پشتیوانیکردنەی بەهۆی خزمایەتییەوە بوو،نەك لەبەرخودی ئایینەکەی و پێغەمبەرایەتییەکەی ،. بۆیە ئەوانەی دەوری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مرۆڤن لەخزم و کەس وکارەکانی وەك هەر مرۆڤێکی تر باوەڕدار و بیّ بڕوای تێدایە.

٢- لێرەدا ڕاستییەکی تر هەیە ئەویش ئەوەیە: محمد (صلی الله علیه وسلم) بە (وحی) بۆتە پێغەمبەر ،کەواتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەڕوانگەی ئەو پەیامەی کەبۆی هاتۆتە خوارەوە ئەڕوانێتە ژیان و دەورو بەرو خانەوادەکەی خۆی ، ئەوەتا بەمامی دەڵێت:(( بەس ئیمان بێنە، تا بتوانم لەرۆژی دواییدا، لەسەر ئەو قسەی تۆ شەفاعەتت بۆ بکەم .)) لە دواتر مامی ئیمان ناهێنیّ. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە خێزانی و مامی لە یەك ساڵ وەفات دەکەن، بەو ساڵە دەڵێن: ساڵی ماتەم (عام الحزن) . دروستە هەردووکیان لە یەك ساڵ وەفات دەکەن و هەردووکیشیان بەرگریان لە پێغەمبەر دەکرد ، هەڵوێستی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەرامبەر هەردووکیان وەك یەك بوو، لە ڕوویی خەمناکی ودڵ توندییەوە ، بەلاّم لە بۆ قیامەت هەڵوێستەکە جیاواز دەبێت. ئەگەر بەرامبەر بانگەوازی

پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) دژایەتی بوایە ئەوە وەك ( ئەبو لەهەب) قسەی تری لەسەر دەکرا. ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) قورئان دەکاتە روئیاو دیدگای خۆی.

لەوکاتەی کەپێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) و هاوەڵانی بەرەو رزگارکردنی شاری (مەککە) دەچن ، دەبینین (ئیمامی عەباس) ئەبو سوفیان دەباتە سەر بەرزاییەك و پێی دەڵێت: ئەوە هۆزی فلانە، ئەوە تیرەی فلانە،( ئەبوسوفیان)یش دەڵێ: ئەوانە لە کوێ ومن لەکوێ ؟! دواتر پێی دەڵێ: یا أبا الفضل ما أعظم شأن ابن أخیك؟

(ئەبو الفەزل) بەراستی ئەمرۆ برازاکەت ناو و دەنگێکی زۆرگەورەی هەیە، بووە بەپیاوێکی گەورە. (عەبباس) یش لە وەلامیدا بە (ئەبوسوفیان) دەڵێت: (إنها النبوة)، ئەو شان و شەوکەتەی کە تۆ باسی دەکەیت ، هی برازاکەم نییە ، بەڵکو هی پێغەمبەرایەتییەکەیەتی، بۆیە ئەمە لە مێژوو لەناو ئەوکۆمەڵگایەی کە پێغەمبەر و(صلی الله علیە وسلم) هاوەڵانی تێیدا ژیاون دوو شت هەبووە ، پەیامی ئاسمانی وە کۆمەڵگەیەکی مرۆڤی و مامەڵکردنیان لەگەڵ ئەو پەیامەدا، هەندێکیان وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن ، لەوانە (ئەبو بەکری صدیق) و (عوسمانی کوڕی عەفان) و(عومەری کوڕی خەتاب) و ( عەلی کوڕی ئەبو تالب) ە، ئەو صەحابانەی کە لە (عشرة مبشرة بالجنة)یان پێ دەڵێن ، ئەوەیە کە پێیان دەڵێن: (أصحاب الشجرە) کە

به بەیعەی (رضـوان) ناسراوە، ئەوە هـەموویان دێـن پـێ بـەپێ لەگـەڵ (وحی)دا مامەڵە دەکەن ، کاتێك کەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلـم) رادەوەستێت بۆ نوێژکردن ، دەبینێت لـە پـشتیەوە دوو کـەس نوێـژ دەکەن ، یەکێکیان بریتییە لە (ئەبو بەکری صدیق) یەکێکیان بریتییە لە (عبـدالله ی کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سـەلول)!؟ کـە سـەرکردەی دوو ڕووەکانە. بۆیە دەبینی ئاستی ئەوانەی کە قورئـان ڕێنومایـیـان ئاڕاسـتە دەکـات یـەك ئاسـت نـین ، واتـە: ئەوانـەی کـە لـە قەزیـەی ئـەبرار تەعامولـیان لـەگـەڵ دەکـرێ،وە ئەوانـەی کـە موحـسنینن تـەعامولیان لەگەڵ دەکرێت ، وە ئەوانەی کە موئمینن تەعامولیان لەگەڵ دەکرێت ، هەریەکەو ڕێنومایی تایبەت بە خۆیان هەیە.

بۆیە ئەوەی لە مێژووی ئیسلامیدا ڕووی داوە، هەمووی دینـداری نییە ، چونکە بەشێکی کرداری مرۆڤە. بۆیە ئەوەی لە قورئـان هـاتووە یان فەرموودەی راسـتی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) ، بـەهیچ شێوەیەك لە شێوەکان نابێت لەگەڵ کرداری مرڤەکان بەراورد بکرێت ، بۆیە دەبێت مامەڵەی ئێمە لەگەڵ (وحـی) پـەیام بێـت، نـەك لـەگـەڵ فەرهەنگ وکلتوری مرۆڤەکان.

ئەوەمان باس کرد کە جیاوازی هەیە لـەنێوان ئـەوەی کـە قورئـان پەیامی خودایە لەگەڵ ئەوەی کە ڕووداوی مێژووییەو ڕوودەدات.

٣- ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مرۆڤ وەك خودی خۆی پیرۆز نییە بەڵکو بەرێزە ، هەروەك کەرستەکان پیرۆز نەبوون تەنیا پرنسیپەکان ، کەواتە لێرە جیاوازییەك هەیە، دەبێت لامان روون بێت، ئەم بنچینەیەش هەموو کەس دەگرێتەوە تەنانەت ناو خانەوادەی پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم)، خەدیجە (ڕەزای خوای لەسەربێت) پیرۆز نییە، بەلاَم بەڕێزە ، خێزانێکی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) ، بۆیە وەك مرۆڤ بەڕێزە بەلاَم نە پیرۆزە، ئێمە دەبێت ئەوەمان لاروون وئاشکرا بێت ،کە باسی (خەدیجە) یە (ڕەزای خوای لێبێت) وەك مرۆڤێکی بەرێزی باوەڕدار، هەریەك لە زەینەب و روقییەو ئوم کەلسوم و فاتیمە وعائیشە (رەزاو رەحمەتی خوایان لێبێت) بەهەمان شێوەن ، کاتێك باسی خانەوادەی پێغەمبەر دەکەین لامان روون بی کە ئەوە خانەوادەی موحەممەدە (صلی الله علیه وسلم) لە نێو ئەم ماڵەدا کچ بەشوودان هەیە ، زاوا دێتە ماڵیان ، مێوانداری هەیە ، ئەوە نەبێ کەوا ئێمە بەکورتی لەکۆڵ خۆمانی بکەینەوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، سێزدە ساڵ هەر ساڵەك ١٢ مانك هەر مانگەك ٣٠ رۆژ هەر رۆژەك ٢٤ سەعات، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەناو ماڵی خۆی کێشەی نەبوونی و فشاری کۆمەلاَیەتی و ڕکابەرایەتی (قورەیش)ی لەسەر بووە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك هەر ماڵێکی تری ئەو واقع و سەردەمەی خۆی لەپێش پێغەمبەرایەتییدا تێکەلاَوی ئەو ژیانە بووە لە کچ بەمێرد دان و مامەڵە لەگەڵ زاواو چونێتی مامەڵە کردن لەگەڵ کچەکانی کە مارەبڕی ئامۆزاکانی بوون

و دواتر ژیانی لێکترازان دێتە پێشیان و..چەندانی تر لەم گرفتانە پێویستە لەبەر چاو بگیرێت لەکاتی لێکۆڵینەوەی ژیانیشیاندا بە حورمەتەوە سەیر بکرێن ، چونکە ئەوان قورئان تەزکییەی کردوون، نابێت تۆمەت بار بکرێن. بەڵام ناتوانین باسیان نەکەین، لەبەر ئەوەی ئەوانە ئەو کەسانەن کە قورئان لەسەر دەمی ئەواندا دابەزیوەو قسەی لەسەر ئەوان کردووەو ئەحکامە شەرعییەکان لەوکاتەدا تۆمار کراوە، بۆیە ناسینیان زۆر گرنگە ودەبێ موسڵمانان ئاگاداری ژیاننامەی ئەم خانەوادە بەرێزە بن ، بۆ ئەوەی لەسەر رێگای ئەوان بڕۆن وخێر وچاکە بەدەست بێنن ، ئەوەی ئێستا ئێمە لەم پەرتووکەدا دەیخەینە بەر دەستی بەرێزتان ژیاننامەی کچەکانی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، بۆ ئەوەی بەرێزتان ئاگاداری رەوشتە جوان و پاکەکانیان بن.

عەبدوللەتیف یاسین

سەرپەرشتیاری ماڵپەڕی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

٢ی شەعبانی ١٤٣٠ی کۆچی بەرامبەر ١٨/ ٢٠٠٩\٨ ی زایینی / هەولێر

خاتوو زەینەب ( ڕەزای خوای لەسەر بێت)
کچی یەکەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

خاتوو زەینەبی گەورە.. یەکەم زێڕو گەوهەر بوو، خودای گەورە بەخشی بە دایکی موسڵمانان (خەدیجە)ی گەورەو پێغەمبەرمان (محمد) (صلی الله علیه وسلم) نێردراوی خودای گەورە .

## لەدایك بوونی زەینەب

ئەوکاتەی( زەینەب) لەدایك بوو، تەمەنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (٣٠) ساڵ بوو، واتە: (٥) ساڵ دوای هاوسەگیری لەگەڵ (خدیجە) ی خێزانی دا.

(زەینەب) بووە سۆمای چاوی دایك و باوكی. ماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پاش لە دایكبوونی (زەینەب) پڕبوو لە خۆشی، کە پێشتر لەم جۆرە خۆشی یەی نەدیبوو، پێش لە دایكبوونی ئەم کچە بچووکەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، جۆرێك لە ماڵ چۆڵی بە ماڵەوەیان دیار بوو.

چاوەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیچ کاتێك لەسەر (زەینەب) نە ئەگوازرایەوە، تەماشای ئەم پێکەنینە جوان و قەشەنگەکەی (زەینەب)ی دەکرد، کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (زەینەب)ی لەباوەش دەگرت و بەسینگی خۆیەوەی

دەنووساند، تەمەنی منداڵیی خۆی دەهاتەوە یاد، لە منداڵییەوە هەستی بەم جۆرە لە باوەش گرتنە نەکردبوو، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتێك لە دایکبوو، باوکی وەفاتی کردبوو، پێش تەواوبوونی قۆناغی منداڵی دایکیشی کۆچی دوایی کرد ، بۆیە دەهاتەوە بیری یەتیمە جوان و بێنازەکەی مەککە، خودای گەورە ئەم ناخۆشییەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پاداشت کردەوە بە بە بەزەیی زۆری خۆی و تەواوەتی نیعمەتەکانی . خودای گەورە خەدیجەی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەکو دایك و باوك و هاوڕێ تەرخان کردبوو، بەسۆزو خۆشەویستییەوە پێغەمبەری لە باوەش گرتبوو، لەولاشەوە لایەنێکی گەورەی بۆ خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) پڕ کردەوە لەلایەنە مرۆڤایەتیەکەی بە بەخشینی زەینەبی ئێسك سوك و رووگەش.

زەینب) عازەب بوو، کچە گەورەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، پێگەیشت و کاتی بە شوودانی هات ،

## مارەبڕینی ( زەینەب ) لە ( ابو العاص کوڕی رەبیع )

سالانێك هات و چوو ( وەکو گوڵ پاك و گەشایەوە ، ئەوەبوو خەڵکانێکی زۆر لە گەنجانی بنەماڵەو پیاوانی شاری (مەککە) دەهاتن بۆ خوازبێنی زەینەب، بەلام قەدەر وابوو، هیچیان نەدەبوونە هاوسەری ژیانی و خوازبێنییەکان رەتدەکرانەوە دەکرانەوە . تاکو رۆژێکیان (ابو العاص)ی پلکزای زەینب (هالەی کچی خوەیلەید)ی دایکی رەوانەکرد، بۆ خوازبێنی زەینەب.

ماڵی (هالە) لە ماڵی خەدیجەی خوشکی نزیك بوو ، زوو زوو سەردانی یەکتریان دەکردو وەك دایك سەیری خەدیجەی خوشکی دەکرد ، خەدیجە بە خوازبێنییەکەی خوشکی رازی بوو ، زۆر پێخۆشحاڵ بوو بەم داخوازییە. بەلام پێویستی بە رەزامەندی باوکی زەینەب هەبوو، کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لێ ئاگادار کرایەوە ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) رازی بوو، داواکاری خەدیجەی رەت نەکردەوە، کە هیچ داوایەکی خەدیجەی پێشتر رەت نەکردبووەوە.

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وخەدیجە جگـە لـە پەیوەنـدی خزمایـەتی لەگـەڵ (ابـو العـاص)زۆر خۆشیـشیا دەویست ، چونکە هەر لەمنداڵییەوە سۆزیان بـۆی هـەبوو، لەبـەر ئـەوەی کەسـێکی لێوەشـاوەبوو ، رێـك و پێـك بـوو. (ابـو العاص)خەریکی بازرگـانی بـوو، لـەنێوان شـام و مەککـەدا، دوو سەفەری هاوینەو زستانەی دەکرد، نیشانەی وەفاداری و پیاوەتی و راستگۆیی پێوە دیار بوو، نموونەی سوارچاکێکی باشبوو، رۆژێـك دیـاری کـراو (زەینـەب)یـان لـە (ابوالعـاص) مـارەبڕی . مـاڵی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پڕبوو لە خۆشـی و بەختـەوەری ، بە بۆنەی بەشـوودانی (زەینـەب)ی کـچەگەورەیان. بـەڵام فاتیمـە (خودا لێی رازی بێت) زۆر دڵ تەنگ بوو ، چـونکە (زەینـەب)ی خوشکە گەورەی کە لە جێی دایکی بوو هەردەم لە باوەشـی بـوو ئەوە ئێستا بـەجێی دەهێڵـێ و دەچـێتە مـاڵی خـۆی و ئەوکاتـەش ( فاتیمە) لەم کـارە حـاڵی نابێـت ، تـەنیا ئـەوە نـەبێت خوشـکە خۆشەویستەکەی وا ماڵی لێ جیا دەکاتەوە .

ئەوەی مەبەست و هیوا بوو، لە بەمێرد دانی ( زەینەب) خۆشی وبەختەوەری بۆ ئەم کـچە دابـین بکرێـت لـە مـاڵی مێردەکەیـدا، چونکە ( زەینەب) لـەماڵی باوکیـدا لـە خۆشـی و بەختـەوەری و

سۆزدا ژیابوو،( زەینەب) دوای گواستنەوەی، لەماڵی مێردەکەیدا بە بەختەوەری دەژیا، لەگەڵ هاوسەرە خۆشەویستەکەی (ابوالعاص)، زۆر ڕێزی یەکتریان دەگرت و کێشەیان لەگەڵ یەکتردا نەبوو،

ڕۆژێك (ئەبوالعاص) بە( زەینەب )ی گوت:( دەچمە سەفەری شام بۆ بازرگانی) ، پاشان خواحافیزی لێ کردو لەگەڵ کاروانەکەی بەڕێ کەوت، زەینەبی بەجێهێشت لەلای دایکی بەو هیوایەی لە ماوەیەکی نزیکدا بگەڕێتەوە.

## دەرکەوتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام

خودای گەورە حەزرەتی (جبریل)ی ڕەوانە کرد، بە پەیامێکی پیرۆز بۆ لای (محمدی کوڕی عبدالله) (صلی الله علیه وسلم) کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بوو، (محمد)ی (صلی الله علیه وسلم) کرد بە نێردراوی خۆی بۆ لای بەندەکان بۆ ئاگادارکردنەوەیان لە ڕاستەقینەی دنیا و ژیان ومردن، دوورکەوتنەوەی خەڵك لە نەزانی و خراپەکاریداو، بگەڕێنەوە لای خوداو، خودای خۆیان بپەرستن و واز لە هاوەڵدانان و بتپەرستی بێنن و خودای گەورە بە تاك و تەنیا بناسن.

ئیتر ئەوەبوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە خێزانەکەیەوە دەستی پێ کردو بانگی خزم و کەسوکارەکانی تری کرد بۆ ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام. سەرەتا خێزان وکچەکانی و دواتر هەندێك لە برادەرو خزم وکەسانی تر هاتنە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

وەك زانراوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوای گەڕانەوەی لە ئەشکەوتی (حرا) بە لەرزو ترس هاتە خوارەوە ، رووداوەکەش ئاشکرایە ، هەروەها رۆڵە گرنگ وبەرچاوەکەی ( خاتوو خەدیجە )ی بەڕێز بەهیچ شێوەیەك مێژوو ناتوانێت لەبیری بکات ، بۆ نمونە هەر کاتێك نوسەرێك یان ووتاربێژێك یان توێژەرێك باس لە سەرەتای هاتنە خوارەوەی ( نیگا ) دەکات دەبێ ئاماژە بە رۆڵی ئەم کەڵە ژنە بکات.

زەینەب گەڕایەوە ماڵی باوکی، کاتێك بینی باوکی وا لەناو جێگایە پرسیاری کرد، لە حاڵی باوکی . خەدیجەی دایکی بەهەمان عەقڵی گەورە وکارامە کچەکانی کۆکردەوە وبەسەرهاتەکەی بۆیان گێڕایەوە ، ئەوکاتە کچەکان هەموویان باوەڕیان بەپێغەمبەرایەتی باوکیان هێنا ، باوکێك کە بە ڕاستگۆیو دەستپاك (صادق الامین) ناسراو بوو چۆن باوەڕی پێ ناهێنن؟.

لەم کاتەدا (ابوالعاص) لە سەفەری (شام)دابوو ، کاتێك گەڕایەوە، لە ڕێگا لە خەڵکانی تر گوێی لەم هەواڵە بوو، کە ئایینی ئیسلام بڵاو بوویتەوە لە لایەن خەزووریەوە ، واتە لە لایەن

پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، بەپەلە گەڕایەوە ماڵ و لە زەینەبی خێزانی پرسی: ئەم پڕوپاگەندەیە چییە؟! وا بڵاوبوویتەوە لە نێوان خەڵکدا، گوایە باوکت ئاینێکی نوێی هێناوتە ناو قوڕەیش، خواوەندەکانی قوڕەیش بە درۆ دەخاتەوە.

زەینەب بەوپەڕی ئازایەتییەوە لەوەڵامدا گوتی: (ئەمە پڕوپاگەندە نییە، بەڵکو ڕاستە باوکم بۆتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ، ئەمە ڕاستە وەکو ڕۆژ، باوکم بانگەواز بڵاودەکاتەوەو ، ئێمە هەموومان موسڵمان بووین، دایکم و من و خوشکەکانم).

(ابوالعاص) گوتی: باوکت لەلای من تاوان بار نییەو (ئەم رستەیە عەرەب بەکاری دەهێنن بۆ کەسێك کە رابوردی پاك وبێگەرد بێت) ، رقم لێی نییە بەڵام ناتوانم باوەڕی پێبهێنم ، لەبەر قەومەکەم ، دواتر چیم پێ دەڵێن (ئەبوالعاص) وازی لەئاینی باب وباپیرانی هێناوە و پاشگەز بویتەوە؟! حەزناکەم بنەماڵەکەم شەرمەندە بکەم!!؟ بەڵام زۆریشی لە خێزانە خۆشەویستەکەی نەکرد ، هەرکەسەی لەسەر ئاینی خۆی مایەوە.

## پیلان دانان بۆ تەڵاقدانی زەینەب و خوشکەکانی

هاوبەشدانەرو و بێ باوەڕەکان زۆر ئازاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وموسڵمانانیان دەدا ، بە هەموو جۆرێك ئەشکەنجەیان دەدان ، بەوەشەوە نەوەستان بیریان لە پیلانێکی تر کردەوە ، ئەویش، تەڵاقدانی کچەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو، بۆئەوەی زیاتر ئازاری دەروونی پێشەوای مرۆڤایەتی بدەن.

قورەیشییەکان.. هەندێکیان بە هەندێکیان دەگووت: خاکتان بەسەر.. بەڕاستی ئێوە خەمتان لەسەر (موحەممەد) هەڵگرتووە ، بەوەی گەنجەکانتان کچەکانی ئەویان هێناوە ، جا ئەگەر کچەکانی بەسەردابدەنەوە ، ئەوا بەم ئافرەتانەوە خەریك دەبێت).

ئەوانی تر گوتیان: ئەوەی بیرتان لێکردۆتەوە ، باشترین بیروڕایە. ئەوەبوو (ئەبو لەهەب) فەرمانی بە کوڕەکانی کرد کچەکانی (موحەممەد) تەڵاق بدەن ، کە (روقیەو ئوم کەلسوم) بوون هێشتا نەگوازرابوونەوە. کوڕەکانی چوون (روقیەو ئوم کەلسوم)یان تەڵاق دا ، بێباوەڕو و بتپەرستەکان بەوەشەوە نەوەستان ، هەندێکیان چوونە لای (عاص) و پێیان گوت: (خێزانەکەت تەڵاق بدەو رەوانەی ماڵی باوکی بکەوە ، ئێمە ژنێکی ترت بۆ دەهێنین ، چۆنی حەز دەکەی لە جوانترین وژیرترین کچانی قورەیش).

(ابوالعاص)یش پێی وتن:(( نەخێر سوێند بەخوا ، من خێزانی خۆم تەڵاق نادەم و بە هەموو ئافرەتەکانی جیهانی ناگۆڕمەوە)).

دواتر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی خۆش بوو، (زەینەب)یش تەڵاق بدرێ و لەلای بێ باوەڕان نەبێ ، وەکو دوو کچەکەی تری تەلاق بدرێت.

## پەنابردنی موسڵمانان بۆ دۆڵی (ئەبو تالیب):

پاش ئەوەی قورەیشییەکان ئازارو ئەشکەنجەی زۆری موسڵمانیان داو بەردەوام بوون لە ئەزیەت و ئەشکەنجەدانیان ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ بنەماڵەکەی و هاوەڵەکانی و هەندێکیش لە بێباوەڕان کە (ئەبو تالیب)ی مامی و لەگەڵ هەندێکی تر لەخزم و کەسەکانی ، روویان کردە (دۆڵی ئەبو تالیب)، بۆ ئەوەی رزگاریان بێت لە دەست ستەمی بت پەرست و بێ باوەڕەکان، (ئەبو تالیب) هەرچەند باوەڕی نەهێنابوو بەڵام هەردەم پشتی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بەرنەدەداو هەردەم هاوکاری بوو، یارمەتی زۆری دەدا.

بێ باوەڕەکان بەردەوام بوون لە هەڵگەڕانەوەو یاخی بوون ، بۆیە قورەیشیەکان هەڵسان بە گەمارۆدانی موسڵمانان لەم دۆڵەدا، بە ستەمکردنێکی گەورەی دڵ رەقانە، بۆ ماوەی (٣) ساڵ گەمارۆیان خستە سەریان و هەموو جۆرە مامەڵەکردنێکیان لێ قەدەغەکردن، تاکو

ژن و ژنخوازیشیان لێ قەدەغەکردن ، ئەم ستەمە ماوەی (٣) ساڵی خایاند، موسڵمانەکان لە ژیانێکی زۆر ناخۆش وسەختدا دەژیان، بە دەست برسیەتی و تینوێتی و نەخۆشی یەوە.. دەیانناڵاند، هەندێك خواردن شایەنی خوارد نەبوو، ئەمان لە ناچاریدا دەیان خوارد. دوای (٣) ساڵ هەندێك لە کەس وکاری موسڵمانەکان، کە بێ باوەڕبوون بیریان لێ کردنەوەو ویژدانیان جوڵا ، ئیتر تاکو کەی خزمەکانیان ئاوا برسی و تینو و نەخۆش بن و، ئەوانیش لە ژیانێکی خۆش و بەختەروەدا بژین و ژن و ژنخوازی بکەن و ژن بهێنن وکچەکانیان بە شوو بدەن ، ئەوانیش لێی بێ بەش بن. ئەوەبوو چەند کەسێك یەکیان گرت و بڕیاریاندا ، بەگوێی بێ باوەڕەکانی تر نەکەن و گەمارۆکەیان لەسەر لابەن ،ئەوە بوو بڕیارەکەیان جێ بەجێ کردوگەمارۆکەیان لەسەر لا بردن.

دوای ئەوەی موسڵمانان لە دۆڵەکە هاتنە دەرەوە، زۆر هیلاك و ماندو و بێ هێزو بەئازاربوون، پاشان مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەخۆش کەوت و وەفاتی کرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر دڵتەنگ و خەمبار بوو، لە وەفات کردنی مامی دا، هەرچەند باوەڕی نەهێنابوو، بەڵام هەردەم پشتیوانی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دەکرد لە ناخۆشی یەکانی دا، پاش (٣) رۆژ لە دوای مردنی (ئەبو تالیب) دایکی ئیمانداران (خەدیجە)ی خێزانی

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەویش وەفاتی کرد (رەزای خـوا لەسەربێت) بە نەخۆشی و لەناوجێدا گیانی سپارد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلـم) لەگەڵ کچەکانی (زەینەب)و (ئـوم کەلـسوم)و (فاتیمـه) فرمێسکی خۆشەویستیان بۆی دەڕشت و توسلیمی ئەمری خودابوون. هەرچی( روقیە) ش بوو، لەوێ نەبوو،لە سەفەری شام بوو.

کۆچی دوایی (خەدیجە)ی گەورە، کاریگەری زۆری هەبوو لەسـەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلـم) وەکو وەزیرێکـی راسـت و راسـتگۆ بوو بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلـم). موسڵمانان ئەم ساڵەیان ناونا (ساڵی خەمناکی) ـ (عام الحـزن) چـونکە پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسلـم) دوو خۆشەویستی بـەوەفا وئەمەکـداری لەدەسـتدا، ئـەوانیش (ئەبو تالیب)و (خەدیجە)ی خێزانی بوون. کە پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسلـم) زۆر پێویستی بەم دووانـە هـەبوو، هیـچی بـۆ نەمایـەوە تـەنها ئارامگرتن و رازی بوون بە فەرمانی خودای گەورە، هیچ نارەزاییـەکی دەرنەبڕی تاکو خودای گەورەی لێ زویر بێ.

## مانەوەی ( زەینەب ) لە مەککە

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فـەرمانی بـە موسـڵمانەکانی ( مەککە) کرد، کۆچ بکەن بۆ مەدینە ، ئیتر یەك یەك و دووان وسیان، دەستیان کرد بە کۆچکردن بۆ مەدینـە ، تـاکو دواتـر خـوای گـەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش کۆچ بکـات و لـەگەڵ (ئەبوبەکر) ی هاوەڵی دا شاری (مەککە) بەجێ بهێڵێ ، ئـیتر ئەوەبوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ (ئەبوبەکر) کەوتنەڕێ ، دواتریش کەس وکاریان لە دوایان چوون، لە خانـەوادەی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) تـەنها (زەینـەب) مایـەوە، ئـەویش لـە مـاڵی مێردەکەیدابوو ، تاکو دوای جەنگی بەدر.

## جەنگی بەدر و سەرکەوتنی موسڵمانان

دوای کۆچکردنی موسـڵمانانی (مەککـە) بـۆ (مەدینـە) وگەیـشتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسـلم) بـۆ مەدینـەو دامەزرانـدنی دەوڵـەتی ئیـسلامی و خـۆ قـایمکردنی موسـڵمانان، بـەردەوامی سـتەمی بـێ باوەڕەکـانی (مەککـە) بـە تایبـەت دوای شـەهیدکردنی (عەبـدوڵلای کوڕی عەمر)، خوای گـەورە ڕێگایـدا بـە پێغەمبـەرو موسـڵمانان بـۆ شەڕکردن لەگـەڵ قورەیـشدا ، بەرامبـەر بـەو سـتەمەی دەرهـەق بـە

موسڵمانان ئەنجامی دەدەن ، لە برسی کردن و دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانیان و لێدان و شەهیدکردنیان ، موسڵمانان هەڵسان بۆ ڕێگەگرتن لە کاروانێکی قورەیشییەکان کە لەشام دەگەڕایەوە ، بەسەرۆکایەتی (ئەبو سوفیان)، کاتێك (ئەبو سوفیان) زانی لە پێشی دانیشتینە ، هەواڵی دا بە قورەیش و ڕێگای کاروانەکەشی گۆڕی ، کاروانەکە رزگاری بوو ، ئەو ژمارە زۆرەی قورەیشییەکان کە بەسەرۆکایەتی (ئەبو جەهل) و (ئومەییە)و هەندێکی تر هاتبوون، کە ژمارەیان نزیکەی (١٠٠٠) کەسێك دەبوون، بەرامبەر سێ سەدو شتێك لە موسڵمانان، بەشداری جەنگیان کرد، لەم جەنگەدا (٧٠) کەس لە بێ باوەڕان کوژران و (١٤) کەسیش لە موسڵمانەکان شەهید بوون، لەم جەنگە زۆرێك لە سەرکردەکانی بێ باوەران کوژران، وەك (ئەبو جەهل) و (ئومەییە).

خوای گەورە هەر لەسەرەتای جەنگەکەوە ، پەیمانی بە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و موسڵماناندا کە زاڵیان دەکات بەسەر بێ باوڕان و سەریان دەخات.

ئەوەبوو سەرکەوتنی بۆ بەدەستهێنان و ژمارەیەکی زۆر لە دوژمنەکانیان بەدەستی موسڵمانان کوژران، بەشێکیشیان لێ بەدیل گیرا، لەسەرەوت و سامانێکی زۆر کە لە بێ باوەڕان بۆیان بەجێما.

یەکێك لە دیلەکان (ابوالعاص کوڕی ڕەبیع)ی مێردی (زەینەب) بوو.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فدیەی لەسەر دیلەکان دانا، بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بکڕنەوە، ئینجا ئەم کڕینەوەش لە نێوان هەزار درهەم و چوارهەزار درهەم بوو، بە گوێرەی پلەو پایەی دیلەکان لەناو میللەتەکەیان و ڕادەی دەوڵەمەندییان.

جا نوێنەرەکانیان دەهاتن و دەچوون لە نێوان (مەککە) و (مەدینە)داماڵیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتبوو بۆ ئازادکردنی دیلەکانیان، (زەینەب)یش نوێنەری خۆی ڕەوانەی مەدینە کرد، کە فدیەی هەڵگرتبوو بۆ ئازادکردنی (ابو العاص)، فدیەکەش بریتی بوو لە ملوانکەیەك کاتی خۆی زەینەب لەلایەن خەدیجەی دایکییەوە پێی بەخشرابوو، لە ڕۆژی گواستنەوەیدا.

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەمەی بینی ڕووخساری پیرۆزی بە پەڕۆکێکی تەنك داپۆشی، لەبەر خەم و پەژارە، ئەوەبوو زۆر بەزەیی بە (زەینەب)ی کچی هاتەوە، ڕووی لە یاوەرەکانی کردو فەرمووی: ((زەینەب ئەم ماڵەی ڕەوانە کردووە، بۆ ئازادکردنی (ابو العاص)، جا ئەگەر بەچاکی دەزانن دیلەکەی ئازاد بکەن و ماڵەکەی بۆ ڕەوانە بکەنەوە، ئەوا بیکەن ، ئەگەرنا ئەوە ئێوە ئازادن)).

ئەوانیش وتیان: بەڵێ.. ئەوەی دەیکەین ، لەبەر دڵخۆشی تۆ ئـەی پێغەمبەری خوا (صـلی الله علیـه وسـلم). ئـەوەبوو (ابوالعـاص)یـان ئـازادکردو ملوانکەکـەی (زەینـەب)یـشیان ڕەوانـەکردەوە بـۆ (زەینەب).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسـلم) مـەرجێکی لەسـەر (ابوالعـاص) دانا، ئەویش ئەوەبوو هەر کە گەیشتەوە (مەککە) یەکسەر بەبێ سستی و دواکەوتن (زەینەب) ئازاد بکات و ڕەوانەی بکاتەوە بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

(ابوالعاص) بازرگان بوو، خاوەنی پەیمان و گرێبەسـت بـوو، بۆیـە پـەیمانی دا بەپێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم)، هـەر کەگەیـشتەوە مەککە(زەینەب) ڕەوانە بکاتەوە بۆ لای باوکی.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێـشتر ئـەو دەسـەڵاتەیان نـەبوو، بەهێز زەینەبی کچی بگەڕێنێتەوە لای خۆی و تا ئەوکاتەش ئایەت لـەم بارەیەوە نەهاتبووە خوارەوە، کە ئافرەتی ئیماندار نابێ لەلای پیاوی بێ باوەڕ دابنیشێ، بۆیە پێغەمبەر (صـلی الله علیه وسلم) لەو کاتـەدا ئـەو مەرجەی بۆ(ابولعاص) دانا، لەلایەکەوە ئایەت دابەزیبوو ولـە لایـەکی تـرەوە پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) هێـزی پەیـداکرد، دووژمنەکانیان ترسـیان لێ نیـشتبوو. (ابوالعـاص) هـەر کەگەیـشتەوە (مەککە) پەیمانی خۆی بەجێهێنا، ئەو پەیمانەی بە پێغەمبەری (صـلی الله

علیه وسلم) دابوو ، فەرمانی بە (زەینەب) کرد، خۆی ئامادە بکات بۆ کۆچکردن بۆ لای باوکی. ووتی: ئایینی ئیسلام من و تۆی لێك جیا کردۆتەوە، پەیمانم بە باوکت داوە کە بتگەڕێنمەوە لای ئەو ، دەبێ زوو خۆت ئامادە بکەیت، نوێنەرەکانی باوکت لە ڕێگا چاوەڕێت دەکەن )).

(زەینەب) ڕازی بوو، بە فەرمانی خوداو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بە دورکەوتنەوەی لە مێردە خۆشەویستەکەی، هەرچەندە ئەم لێك جیا بونەوەیە بۆ(زەینەب) ناخۆش بوو، لەبەر ئەوەی لەگەڵ (ئەبوالعاص) زۆر یەکتریان خۆش دەویست. بەڵام لەبەرئەوەی (ئەبولعاص) ئیمانی نەهێنابوو، هێشتا موسڵمان نەببوو، بۆیە ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەیەکی جیاکردنەوە،( زەینەب ) فرمێسکی زۆری ڕشت، بەڵام ووتی: تەنها دەبێ گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بین (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (( قسەی کردو ڕاستی کرد، پەیمانی داو جێبەجێی کرد))، و لەریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (پاشان من کچی خۆم لە (ابوالعاص) مارەکرد، قسەی کردو ڕاستگۆ بوو).

# کۆچکردنی زەینەب بۆ مەدینە

ئەو شەوەی کە زەینەب خۆی ئامادەکرد، بچێت بۆ مەدینە، (هندی کچی عوتبە) کە خێزانی (ئەبو سوفیان) بوو، هاتە لای زەینەب، کە ئەو کاتە باوك ومام و برای کوژرابوو، لە شەڕی بەدر، بەڵام هاتە لای ( زەینەب )و ووتی: لە ڕۆیشتندا پێویستیت بە چ هەیە؟ ماڵ ، پارە هەر شتێکی ترت پێویستە، شەرم مەکە، من یارمەتیت دەدەم).

( زەینەب) زۆر سوپاسی ئەم هەڵوێستەی ( هند )ی کرد بۆئەونەرم نیانیەی کەلەبەرامبەری نواندی . ( زەینەب) خۆی ئامادەکرد، لەگەڵ (کینانەی کوڕی رەبیع)ی شوبرای ، واتە لەگەڵ (کینانە)ی برای (ابوالعاص) کەوتنە ڕێ بۆ ڕۆیشتن، بەڵام بێ باوەڕان کاتێك بەم کۆچکردنەیان زانی، هەڵسان بە دوایان کەوتن،(هەباری کوڕی ئەسوەد) و (نافیعی کوڕی عەبدی عەمرو فەهری) هەڵسا بە لێدانی ( رەمح ) لە (زەینەب) .

(زەینەب ) پاش ئەوەی بریندداربوو، خوێنی لێ ڕژا، بۆیە (کینانە) بە ناچاری زەینەبی گەڕاندەوە( مەککە ) تاکو ژیانی نەکەوێتە مەترسیەوە.

(ابوالعاص) کاتێك زانی ئەمە بەسەر(زەینەب) هاتووە نیگەران بوو، لەلایەك زۆر سووی لە زەینەب بۆوە، لەلایەکی تر لەبەر پەیمانەکەی، کە لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داویەتی: کە (زەینەب) بە پەلە بگەڕێنێتەوە لای، بۆیە دوای دوو شەو یاخود سێ شەوی تر،

جارێکی تر دووباره (کینانه) لەگەڵ (زەینەب) دا کەوتنەوه رێ وبردی بۆ لای ئەو دوو پیاوەی که پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ناردبووی بۆ دەرەوەی مەککه.

کینانه (زەینەب)ی رادەستی ئـەو دوو پیـاوه کـرد ، تـاوەکو زوو بیگەڕێننەوه لای پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ، پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) یەکەم جار بڕیاری دا، ئەو دوو پیـاوه بـێ بـاوەڕه، واتـه (هەبار و نافیع) بسوتێندرێن، بەلاّم پاشـان پێغەمبـەر (صـلى الله علیـه وسـلم) رای گـۆڕی، چـونکه خـوای گـەوره لـەدوا رۆژدا مـرۆڤ دەسوتێنێ، نابێ سزا به سزای خوا بچێ، بۆیه بڕیاری دا بکوژرێن.

زەینەب لەگەڵ نوێنەرەکانی رۆیشت تاکو گەیشتنه مەدینه، پێغەمبەر (صـلى الله علیـه وسـلم) هاتـه پێشوازی لەگـەڵ (ئـوم کەلـسوم و فاتیمه)دا، بەلاّم روقیه وەفاتی کردبوو. لـه ریوایەتێکی تردا (هەیسەمی) لـه (مجمع الزوائد)دا دەگێڕێتەوه لـه (عروەی کوڕی زوبێر) دەڵێ: دوو پیاو له قوڕەیـشیەکان دوای (زەینـەب)ی کـچی پێغەمبـەر (صـلى الله علیه وسلم) کەوتن و شەڕیان لەگەڵـدا کـردن، تـاوەکو سـەرکەوتن پاڵیان نـا بـه (زەینـەب) و بەریانـداوه ، سـەری کـەوت بەبـەردێك و خوێنێکی زۆری لێ هات، بردیانەوه لای (ئەبو سوفیان) و، ئافرەتەکانی (بەنی هاشم) هاتن بۆ لای. پاشان کۆچبەرێك هات و لەگەڵ خـۆی دا بردی، بەلاّم (زەینەب)ئەم برین و ژانەی کۆتایی نەهات، تاوەکو دواتـر

بەم هۆیەوە کۆچی دوایی کردو شەهید بوو. ( الهـاشمی، الطـبري وهـو مرسل، ورجال الـصحیح ) ریوایەتیان کردوە.

(زەینەب) خوێنێکی زۆری لێ رژابوو، بۆیە نەخۆش کەوت وکەوتە ناو جێ، لەژێر چاودێری باوکیدا بوو، کە زۆر بە سۆز بوو لەگەڵیدا، خوشکەکانی (فاتیمەو ئوم کەلسوم) چاودێریان دەکرد.

(زەینەب) زۆری چـاوەڕێ کـرد، بـۆ موسـڵمانبوونی مێردەکـەی (ئەبو لعاص)، تاوەکو خوای گـەورە چـاوەکانی پـیێ گـەش بکاتـەوە، جیابوونەوەی (زەینەب و ابوالعاص ) زۆ نـاخۆش بـوو، هـەردووکیان یەکتریان لە بیر نەکردبوو،

(ابو العاص) هەردەم یادی زەینەبی دەکردەوەو زۆر بیری دەکـرد، کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام لێکی دوور خستبوونەوە.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بـە ئـەمین نـاوبردرا، ئـەویش لەبەر ئەوەی دڵی روناك و راست و چەسپاو بووەو ئەمانەت پـارێزراو بووە ، بۆ رێکخستنی موسڵمانانیش هیوا بەجێ بووەو هیوای گەورەی بە دەست هێناوە.

(ابوالعاص) هەر بە کافری مایەوەو گومڕابوو تا پێش رزگارکردنی مەککە، بۆ بازرگانی سەفەری شامی کـرد، قورەیـشیەکان دەیـانزانی , باوەڕیان هەبوو، بە (ئەبولعاص )کە دەست پاك و بە وەفـاو راسـتگۆو بەڕەوشتە. بۆیە ماڵ و سامانی خۆیان پیێ ئەدا بۆ بازرگانی.

(ابوالعاص) ئەو شتانەی پێی بوو فرۆشتی و شتی تری پێی کڕی، لەکاتی گەڕانەوەیدا لە ڕێگا توشی سریەکی موسڵمانان بوو، موسڵمانەکان ڕێگایان بەکاروانەکەی گرت، ئەم سریەیە بەسەرۆکایەتی (زەیدی کوڕی حارثة) بوو، گەمارۆی کاروانەکەیانداو هەموو پیاوەکانی (ابوالعاص) بە دیل گیران و دەست بەسەر شتومەکەکانیشی گیرا، تەنها خۆی هەڵات و رای کرد، شتەکانی کاروانەکەیان، لەگەڵ دیلەکان هێنا ، بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

کاتێك شەو داهات ( ابوالعاص) خۆی پێچاو بە دزیەوە بەرەو ناو مەدینە چوو، زۆر دەترسا نەوەکو کەسێك ببینێ و بیناسێ، خۆی گەیاندە لای (زەینەب)ی خێزانی وداوای لێ کرد پەنای بدات، ئەویش پەنای دا، موسڵمانان بۆ نوێژی بەیانی چوون، لە دوای قامەت کە (زەیدی کوڕی حارثة) و هێندەی نەمابوو بۆ نوێژی بەیانی، لەوکاتە (بیلالی حەبەشی) بانگی دا، ژن و سریەکەشی ئامادەی نوێژکردن بوون، موسڵمانان ریزبوون بۆ نوێژ، لەوکاتەدا دەنگی ئافرەتێك بیسترا لە ریزی ئافرەتاندا ئەویش دەنگی (زەینەب)بوو، وتی: ((ئەی خەڵکینە من زەینەبی کچی (محمد)م (صلی الله علیه وسلم) ، (ابوالعاص) پەنای بۆ هێناوم، دە ئێوەش پەنای بدەن)). کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەلامی نوێژی دایەوە، رووی لە خەڵکەکە کردو

فەرمووی: ((هل سمعتم ما سمعت ؟)) واتە:(( ئایا ئـەوی بیـستم ئێـوەش بیستتان؟)).

ئەوانیش گوتیـان: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـە وسلم) . پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ((سوێند بـەوەی گیانی منی بەدەستە بە هیچ شتێکم نەزانیوە لەمە، تـاکو ئـەوەی گـوێم لێ بوو، ئێوەش گوێتان لێ بوو، ئینجا موسـڵمانیش پـەنای لـەخۆی نـزمتر دەدات )). پاشـان پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) چـۆوە ماڵەوەو بە کچەکەی فەرموو: (( رێز لە (ابوالعاص) بنـێ و بزانـە تـۆ بەڕاستی حەلاڵی ئەو نیت)) . پاشان بانگی ئـەو سـریەی کـرد، کـەوا کاروانەکەیان گرتبوو، پیاوەکانیان بـە دیـل گرتبـوو، پێـی فـەرموون: "بەڕاستی ئەم پیاوە لەئێمەیە هەروەك دەزانن، ئێوە ماڵەکەتان گرتـووە، ئەگەر چـاکەی لەگـەڵ بکـەن و ماڵەکـەی بـۆ بگێڕنـەوە ئێمـە حـەز دەکەین، ئەگەر پێیشی نەدەنەوە، ئەوا دەسکەوتەو لێتان حەلاڵەو ماڵی ئێوەیە.

ئەوانیش گوتیان: ((( ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسـلم) بەڵکو ماڵەکەی بۆ دەگێڕینەوە)). ئەوان هەموو ماڵەکەیان بۆگێڕایەوە.

پێغەمبەر (صـلی الله علیـە وسـلم) داوای لـە (ابوالعـاص) کـرد موسڵمان بێت، ئەویش لە وەڵامدا وتی: (( خراپترین شتە ئەوەی ئێـوە داوای دەکەن لێم، بۆ یەکەمجار بە ناپاکی بێمە ناو ئایینی نوێ )).

یاوەران هەموو شتەکانی کاروانەکەیان بۆ (ابوالعاص) گەڕانــدەوە، (ابوالعـاص) بــە خـۆی و بــە بـاوەڕەوە گەڕایــەوە (مەککــە)، کاتێـك گەیشتەوە مافی هەموو خاوەن مافێکی دایەوە، پاشــان گـوتی: (( ئــەی کۆمەڵی قورەیش هیچ کەسێك ماڵی لەلای من ماوە نەمدابێتەوە؟!)).

گوتیان: ((نەخێر ئەی (ابوالعاص) خوا پاداشتی چـاکەت بداتــەوە، بەڕاستی لەگەڵ ئێمە بە وەفاو بەڕێز بوویت )).

(ابوالعاص) گوتی: (( ئەوە ماف و ماڵی ئێوەم دایەوە هیچتان لای من نەما ، ئینجا ئێستا من شاتومان دەهێنم (أشهد أن لا الـه الا الله وأن محمداً رسول الله) سوێند بەخوا هیچ شتێك قەدەغەی نەکردووم بـچمە ناو ئیسـلام ،کاتێك لـە مەدینە بووم ، تەنها لەوە دەترسـام گومـانم پـێ ببەن کەوا من نیازی ئەوەم بووبێ ماڵتان بخۆم.. جا کاتێك خـودا وای کرد ماڵەکەتان بۆ بگێڕدرێتەوەو هیچم لەسەر نەما موسڵمان بووم)).

پاشان لــە (مەککــە) دەرچـوو بـەرەو (مەدینــە)، رانەوەسـتا تـاکو گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسـلم) جـا ئـەویش رێزی لێ گرت و خێزانەکەی بۆ گێڕایەوە.

پێغەمبــەر (صــلی الله علیــه وســلم) زۆر دڵــی خـۆش بـوو، بــە موسڵمانبوونی (ابوالعاص) و (زەینەب)یش زۆر بەختــەوەرو دڵخـۆش بوو، (ئەبولعاص) باوەڕی چەسپاو بە دڵێکی پاك ئیمانی هێنا.

ئەمـەش لـە سـاڵی (٧)ی کۆچـی دابـوو، بـەم جـۆرە خۆشـی و بەختەوەری گەڕایەوە ناو خێزانی (ابوالعاص).

بەڵام تا ئەو کاتەش زەینەب هەر تەندروستی باش نەبوو.

## نوێژکردنی زەینەب

خاتوو(زەینەب)ی کچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسـلم) نوێـژی زۆری دەکردو زۆر لە خوای گەورەو میهرەبان دەپاڕایـەوە ، هـەردەم خەریکی نزابوو، هەرچەندە نەخۆش و بێ تاقەت بوو، هـەتا جارێکیـان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چووە مزگەوت بینی حەبلێك لە دوو کۆڵەکەی مزگەوت بەستراوە، کاتێك پرسیاری کـرد: (( ئـەم حەبلـە چی یە لێرە؟ )) ئافرەتەکانی ناو مزگەوت وەڵامیان دایەوەو گوتیان: (( ئەمە (زەینەب) لێرەی بەستاوە، زۆر نوێژ دەکات وکاتێك زۆر ماندو و بێ تاقەت دەبێت، لە خەوان وەنەوز دەدات، خۆی بەم پەتە رادەگرێت ، بۆ ئەوەی نەکەوێت )).

پێغەمبەر (صلى الله عليـە وسـلم) فـەرمانی بـە ئافرەتـەکان کـرد پەتەکە لێ بکەنەوە، پێی راگەیاندن کە نوێژکردن بەم جۆرە نابێت، نوێژ نابێت لە کاتی زۆر هیلاکی و بێ هێزی یاخود لەکاتی بـێ هۆشـییەوە ئەنجام بدرێت، بەڵکو دەبێت مرۆڤ لەکاتی زەوق وتواناو ئاگابوون لـە نوێژەکان ، نوێژ ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی ئاگـای لـە نوێژەکـەی بێـت. ئافرەتەکان فەرمانەکەیان جێبـەجێکردو پەتەکـەیان لێ کـردەوەو لایـان برد.

# نەخۆشی زەینەب

نەخۆشی (زەینەب) سەری هەڵدایەوەو تەشەنەی کرد، ئازارەکـانی جارجار کەمی دەکرد، دواتـر زیـادی دەکـردەوە، بـەڵام لەگـەڵ ئـەم نەخۆشـییەدا ئـەم دڵخۆشـییەی نەدەشـاردەوە، کـە (ئـەبولعاص)ی هاوسەری لـە تاریکی بێ باوەڕی و گومڕایی رزگاری بووەو هاتۆتە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسـلام و روناکی ئیسـلام لـە دڵیـدا جێگیربـووە، زۆر سوپاسی خودای گەورەی کرد، بۆ گەڕانـەوەی (ئـەبولعاص) لـە بـێ باوەڕییەوە بۆ ئیمان و لە کوفرەوە بۆ ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

لاشەی (زەینەب) بەرگەی ئەم نەخۆشیەی نەدەگرت، رۆژ بـەرۆژو ساڵ بەساڵ لەگەڵ ئەم نەخۆشیەی دا دەژیا، زۆر جار دوعای دەکرد بە لیقای خودای گەورە بگات.

# وەفاتی وناشتنی زەینەب

(زەینەب) و (ئەبولعاص)ی مێردی دوای چەند ساڵێك لەیەك دابڕان دواتــر هێنــدە بەیەکــەوە نــەژیان، (ابولعــاص) ســاڵی (٧)ی کۆچــی موسڵمان بوو، گەڕایەوە لای (زەینەب).

(زەینەب)یش لەساڵی (٨)ی کۆچیدا ،کۆچی دوایــی کــرد، واتــە دوای دابڕان ساڵێك بەیەکەوە ژیان.

مردن ئاینده و کۆتی هەمووگیانلەبەریکه ،هه رچی دروستکراوه دەبی بمریت تاپێغەمبەرانیش (درودوسەلامی خوایان لەسەربێت ) دەبێ بمرن وئەم دونیایه جێبهێڵن، خاتوو (زەینەب)یش یەکێکه له بەندەو دروستکراوەکانی خودا ، ئەویش (رۆح)ی تەسلیمی فەرمانی خودا کرد وگەڕایەوە بەر قاپی خودای گەورە.

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کچه شیرینەکەی وەفاتی کرد ، رازی بوو بە فەرمانی خودا و لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە یاوەرەکانی کۆبوونەوە بۆ ناشتنی (زەینەب).

(ابولعاص) خۆی بۆ نەگیرا، زۆر بەجۆش بۆ (زەینەب) گریا، ئینجا (زەینەب) لە گۆڕستانی (بەقیع) نێژرا. (خوای گەورە رەحمی زۆری پێ بکات وجێگەی بەرز بێت لە بەهەشتدا، لەگەڵ ئافرەتانی ئیماندار).

(ابولعاص) دوای چوار ساڵ لە دوای (زەینەب) ئەویش کۆچی دوایی کرد، واتە لە ساڵی (١٢)ی کۆچیدا وەفاتی کرد.

# نەوەکانی زەینەب

(زەینەب) کچێکی هەبوو بە ناوی (ئەمامە) لە (مەککە) لەدایك بوو بوو، ئەو کاتەی کۆچی کرد بـۆ مەدینـە لەگـەڵ خـۆی دا هێنـابووی، دوای مردنی زەینەب (ئەمامە) لای باوکی بوو، دوای وەفـاتی بـاوکی چووە لای (فاتیمە)ی پلکی. هەندێك سەرچاوە دەڵێن: زەینەب جگـە لە (ئەمامە) کوڕێکی بەناو (عەلی) هەبووە.

لێرەدا پەردە لە سەر ژیانی کچە گەورەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دا درایەوە ولەسـەر شـانۆی ژیـان لاکـەوت ، چـووە ریـزی کاروانی کاروانانی رۆژی دوایی.

(روقیه) دووەم کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، ئەویش هەر لە (خەدیجە)ی دایکی ئیمانداران بوو، دایك وباوکی بە باشترین شێوە بەخێویان کردو پەروەردەیان کرد، مافی چاودێری کردنیان پێشکەش کرد، لەلایەن (زەینەب)ی خوشکی گرنگی پێدرا کە بریتی بوو لە خۆشەویستی وسۆزێکی زۆر بۆ ئەم بەرێزە.

# شوکردنی روقیه

کاتێك (روقیە) وادەی بەشوودانی هات، ئەوەبوو مامەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کە پێك هاتبوون بوون لە (ئەبو تالیب)و (ئەبو لەهەب) هاتنە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خوازبێنی (روقیە)یان کرد بۆ کوڕانی (ئەبو لەهەب) بەم شێوەیە: (روقیە) بدەن بە (عوتبە)، هەرچەندە (عوتبە) گونجاو نەبوو بۆ (روقیە) بەڵام بەهۆی خزمایەتی یەوە، دایان پێی.

وە (ئوم کەلسوم) بدەن بە (عوتەیبە). پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) رازی بوو، کچەکانی پێدان ومارەکران. کە هێشتا پەیام بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)دانەبەزی بوو. دواتر بۆماوەی (۳) ساڵ بە نهێنی بانگەوازی دەکرد، دواتر خوای گەورە لە چەند ئایەتێکدا لەم بارەیەوە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) ئاگادار کردەوە، خوادای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ

الأَقْرَبِينَ(٢١٤)وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنْ اتَّبَعَكَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ(٢١٥)فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تَعْمَلُونَ(٢١٦)وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ(٢١٧)﴾(الشعراء: ٢١٤-٢١٧).

واته: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) سەرەتا عەشیرەت وتایفەو کەسوکارە نزیکەکانت بێدار بکەرەوە، باڵی بەزەیی ومیهرەبانی خۆت نەوی بکە بۆ ئەو ئیماندارانەی کە شوێنت کەوتوون، ئەگەر خوانەناسان یاخی بوون وسەرپێچیان کرد.. ئەوە پێیان بڵێ: کە بەڕاستی من بەریم لەهەموو ئەو کاروکردەوانەی کە دەیکەن، ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پشت بەخوای بالادەست ومیهرەبان ببەستە.

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ(٩٢)عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ(٩٣)فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنْ الْمُشْرِكِينَ(٩٤)﴾(الحجر). واته: سوێند بە پەروەردگارت پرسیار لە هەموویان دەکەین بە گشتی (لەبیروباوەڕی هەموویان دەکۆڵینەوە)، لەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد، هەر فەرمانێکت پێدراوە (ئەی محمد صلى الله عليه وسلم) بە ڕێك وپێکی ئەنجامی بدەو گوێ مەدە بە بوختان ورەفتاری بێ باوەڕو هاوەڵگەران.

دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەڵسا بە بەجێگەیاندنی فەرمانی خودا، ئیتر سەردەمی نهێنی

کۆتایی پێهات ئەو دەبێ بەئاشکرا بچێتە لای خزم و کەس و خەڵکانی تر، بە ئاشکرا بانگیان بکات بۆسەر ئایینی خوا.

ئیتر ئەوەبوو ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەڵسا بەبانگکردنی خەڵك بۆسەر ئایینەکەی، سەرەتا چووە لای خزمە نزیکەکانی.

بەیانییەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی کەسوکارەکانی خۆی کرد، دەیویست باسی خواو خواناسیان بۆ بکات و بانگیان بکات بۆسەر ئایینی ئیسلام، بەڵام (ئەبو لەهەب)ی مامی قسەکانی پێ بڕی و بەزۆر خزمەکانی هەڵساند لەلای. جارێکی تر بانگی کردن و دوای نان خواردن پێی وتن: ((خزمەکانم هیچ کەسێك لەعەرەب شتێکی گەورەتری بۆ نەهێناون لەوەی من هێناومە بۆ کەسوکاری خۆی، من خێرو بێرو سەربەرزی ئەم جیهانەو جیهانەکەی تریشم بۆ ئێوە هێناوە، خوای گەورە داوای لێکردووم کە بانگتان بکەم بۆ سەر ئایینی ئیسلام، کێتان لەسەر ئەم ئیشە گرنگە پشتیوانم دەکا؟)).

هەموویان روویان لێی وەرگێڕاو ویستیان بەجێ ی بێڵن، بەڵام پێشەوا(عەلی) راستبووەو کە هێشتا منداڵ بوو، وتی: (( من ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یارمەتی دەرت دەبم، من هەرا بەرپادەکەم لە دژی ئەوەی هەرات لەگەڵ دەکا )).

(بـەنی هاشـم )ی یـەکان کەوتنـە بزگـرتن و هەنـدێکیان قاقـای پێکەنینیان کرد، هەندێکی تریان لەژێرەوە بۆ (عەلی) و (ئەبو تالیب)یان دەڕوانی، پاشان بە گاڵتەکردنێکەوە هەڵسان و بەجێیان هێشتن.

جارێکی تر خزم وکەسەکانی کۆکردەوەو فەرمووی پێیان: (( پێشەوا درۆ لەگەڵ کەسوکاری خـۆی ناکـات، بـەخوا ئەگـەر خوانـە خواستە درۆم لەگەڵ هەرکەس بکردایە لەگەڵ ئێوەدا نەمدەکرد، ئەگەر خەڵکیم بخەڵەتاندبوایە ئێوەم هەڵنەدەخەڵەتاند، بـەو خوایـەی هـاوەڵی نییە ، بێجگە لەو خوایە کەسی تر نی یە، من پێغەمبەری خوام ، بۆ لای ئێوە بەتایبەتی وە بۆ لای هەموو مرۆڤێك بە گشتی هاتووم. بەخوا چۆن دەخەون هەروەهاش دەمرن، چۆن لەخـەو هەڵدەسـتن بـەو شـێوەیەش زیندوو دەکرێنەوە، لەسەر کردەوەکانتان پرسیارتان لێ دەکرێ و لێتان دەپرسرێتەوە و پاداشتتان دەدرێتەوە بە چاکە لەسـەر چـاکەو بەخراپـە لەسەر خراپە، ئینجا یان بەهەشتی هەتا هەتاییە یان دۆزەخی هەتاهەتاییـە )). خزمەکانی هەموو بە نەرمی وەڵامیان دایەوە تـەنها (ئـەبو لەهـەب) نەبێ وتی: (( دەستی بگرن پێش ئەوەی هەموو عەرەب کۆمەڵە بکاتـە سەری، ئەوسا ئەگەر دەیدەن بەدەستەوە ریسوایی یە، نایدەنە دەسـتەوە لەناو دەچن )) . (ئەبوتالیب) وتـی: ((بـەخوا تـا مـاوین پـشتگیری لێ دەکەین)).

بانگەوازی ئایینی ئیسلام وردە وردە پەرەی سەندو لەسنووری خزمەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تێپەڕی و گەیشتە هەموو (قورەیش) ودانیشتوانی مەککە. (ئیبن عەباس) خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوای هاتنی ئایەتی پێشوو ، چووە سەر تەپی (سەفا)و کەوتە بانگکردنی (قورەیش)یەکان و وتی: (( ئەی نەوەی فەهرە، ئەی نەوەی عەدی...)) هەتا هەموو تیرەکانی بانگکرد، (قورەیش)یەکان وتیان: (محمد) بانگ دەکات، هەموو روویان تێکردو چوون بۆلای بزانن بۆچی بانگیان دەکات، پێیگوتن: (( ئەگەر هەواڵتان بدەمێ: لەشکرێك وا لەو دۆڵەدا، یا وا لەپشتی ئەو کێوەدا، دەیەوێ هێرش بکاتە سەرتان، ئایا باوەڕم پێ دەکەن؟. وتیان: بەڵێ، چونکە هیچ درۆمان لێنەبینی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (( دەی دەتانترسێنم بەسزای سەختی خوا، ئەگەر باوەڕ بەخوای تاك و تەنیا نەهێنن و موسڵمان نەبن و واز لە بت پەرستی وهاوەڵدانان بۆ خوا نەهێنن، ئەی نەوەی (عەبدولمەناف)، ئەی نەوەی (زوهرە)، ئەی نەوەی (تەمیم)، ئەی نەوەی (مەخزوم) ئەی نەوەی (ئەسەد)... خوا فەرمانی پێداوم کە خزمە نزیکەکانم بترسێنم، من نە لەم جیهانەداو نە لەپاشەرۆژدا ناتوانم هیچ کەڵك وسوودتان پێ بگەیەنم ، هەتا شایەتمان نەهێنن و نەڵێن (لا الە الا الله محمد رسول الله)).

(ئەبو لەهەب)ی مامی کە پیاوێکی قەڵەوی رق ئەستوور بوو، راست بووەوەو هاواری کرد: (( داوەشێی ودارزێی ، هەموو رۆژێ هەر لەبەر ئەوە ئێمەت بانگ کرد؟!)) .

پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بە دڵتەنگییەوە بۆی رۆیی، پاشان (ئەبو لەهەب) گەڕایەوەماڵەوە، بەخێزانەکەی وت کە ناوی (ئوم جەمیل) بوو، رێککەوتن کە خۆی وخێزانەکەی بەرامبەر بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ببنەوە.

(ئەبو لەهەب) لەناو پیاواندا دەوری خۆی ببینێ لە دژایەتی کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ، (ئوم جەمیل)ی خێزانیشی لەنێو ئافرەتاندا دەوری خۆی ببینێ.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرکاتێك لەگەڵ هەندێك لە پیاواندا ئەوەستا باسی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی بۆ دەکردن، بۆ ئەوەی ببنە موسڵمان و، بێنە سەر ئایینەکەی، لەو کاتانەدا (ئەبو لەهەب)ی مامی لە پشتییەوە ئەوەستاو بەخەڵکەکەی ئەوت: (( باوەڕی پێ مەکەن درۆزنە )).

(ئوم جەمیل) لەنێو ژناندا هەوڵی دەدا کە رقیان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بێتەوە، ئافرەتەکانی تری بەدرۆو قسەی ناڕاست هەڵدەخەڵەتاند. (ئوم جەمیل) دڕك ودالی لەسەر رێگای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دادەناو ئازاری پێغەمبەری (صلی الله علیه

وسلم) پێدەدا، لەکاتێکدا ئەو نەیدەزانی خودای گەورە بەرامبەر ئەو کردەوە خراپەی خۆی ومێردەکەی چ سزایەکی بۆ داناون. خودای گەورە بەحەزرەتی (جوبریل) سورەتی (المسد)ی ناردە خوارەوە کە تایبەت بوو بە ڕووداوی (ئوم جەمیل) کە دڕك ودالّی لەسەر ڕێگای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دادەنا.

کردەوەکانی (ئەبو لەهەب)ی مێردی کە خراپەی زۆری بەرامبەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەنجامدەداو بەدرۆی دەخستەوە قسەی ناشیرینی پێ دەگوت و دژایەتییەکی زۆری بەرامبەری دەکرد. خوای گەورە لە وەلامی ئەم کردەوە قێزەونانەی جێگای دوا ڕۆژی بۆ( ئەبولەهەب) و(ئوم جەمیل) لە دۆزەخ دیاری کرد ،کە لە سورەتی (المسد) دا پێیان دەڵێ: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ(١)مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ(٢)سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ(٣)وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ(٤)فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ(٥)﴾.

واتە: ١- دەستەکانی بشکێت ئەبو لەهەب وریسوا بیت، ئاشکرایە کە هەر ریسوا دەبێت و (لەناو دەچێت).(١)

چوو بۆ کەعبە بۆ ئەوەی بەم بەردەی دەستی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بدا ٢- ماڵ ودارایی و ئەو شتانەی کە بەدەستی هێناوە، فریای نەکەوت.

٣- لە ئایندەدا دەخرێتە ناو ئاگرێکی بلێسەدارەوە.

٤- هەروەها ژنەکەشی کە هەمیشە هەڵگری کۆڵەدارەو (ئازاری) پێغەمبەری (صلی اللە علیه وسلم) دەدات.

٥- هەمیشە گوریسێکی چنراو لە پووشی خورما لە گەردەنیایەتی (لە قیامەتیشدا زنجیری ئاسن دەکرێتە گەردەنی).

کاتێك (ئوم جەمیل) زانی ئەم سورەتە لەسەر خۆی و مێردەکەی هاتۆتە خوارەوە، بەردێکی لەدەستدا بوو بەپەلە ات. ئەو کاتە پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) لەگەڵ (ئەبو بەکر) لە (کەعبە) دانیشتبوون، (ئوم جەمیل) هاتە ناو کەعبەو راوەستاو سەیری کرد، تەنها (ئەبوبەکر)ی بینی، بە (ئەبوبەکری) وت: (( ئەی لەکوێ یە برادەرەکەت؟ )) واتە: (پێغەمبەر)ی برادەری ، وتی: (( بەم خوایە لێرە بوایە بەم بەردە لێم دەدا)).

دواتر رۆیی، (ئەبوبەکر)گوتی: (( ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە چیتی؟ بۆچی تۆی نەدیت؟!)).

پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) فەرمووی: (( خودای گەورە ئەم بینینەی لێ سەندەوە کە منی پێ دەدیت )).

(ئەبو لەهەب)و (ئوم جەمیل) تا دەهات زیاتر ئازاری پێغەمبەریان دەدا، بەڵام پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) زیاتر موکوڕتر دەبوو، بەهێزتر دەبوو ، لە بانگەوازەکەیدا، رۆژ بەرۆژ بانگەوازەکەی پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) سەردەکەوت، هەرچەندە کەسانی وەك (ئەبو

لەهەب)و(ئوم جەمیل)و (ئەبو جەهل) تەگەرەیان دەخستە سەر ڕێگای، تا خەڵکی تر شوێنی ئاینەکەی نەکەون.

ئەم ژن و مێردە پیسە، هەرچییان دەکرد ، لەدژایەتی کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پیلانەکانیان شکستی دەهێناو سەری نەدەگرت، بەلاٚم کارێکی خراپتریان ئەنجامدا، ئەویش تەلاٚقدانی کچانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، تاکو کاریگەریی هەبێ لەسەر دەروون و کەرامەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تاکو بتوانێ ئازاری (محمد)ی (صلی الله علیه وسلم) برازای بدات، بۆیە فەرمانی بە (عوتبە)ی کوڕی کرد، کە بچیتە لای پێغەمبەرو (روقیە)ی کچی تەلاٚق بدات، (عوتبە) بەقسەی باوکی کردو چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و کچەکەی کە (روقیە) بوو تەلاٚقی داو، گەڕایەوە لای باوکی و هەواڵی تەلاٚقدانەکەی بە باوکی ڕاگەیاند، لە کاتێکدا (روقیە) هێشتا نەگوازرابۆوە هەر لەماڵی باوکی دابوو، واتە بەس مارەکرابوو.

ئیتر (روقیە) هەر لەلای دایك و باوکە بەڕێزەکەی مایەوە، لەناو سۆزو خۆشەویستی ئەواندا بەردەوام بوو.

ئەگەر ئەم دوو نەگریسە (ئەبو لەهەب) و (ئوم جەمیل)ی خێزانی، سەرکەوتوو بوون لەو پیلانەی گێڕایان لە دژایەتی و ئازاردانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە ئازاردانی گەورەترین مرۆڤ بوو؟..

له وەڵامی ئەو کارو کردەوەیان خودای گەورە بە پێغەمبەری فەرموو: ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ..﴾(المائدة:٦٧).

واته: (دڵنیابه) خوا دەتپارێزێت لە شەڕو خراپەی خەڵکی،..
بێگومان (ئەبو لەهەب)و خێزانەکەی لە هەردوو جیهاندا دۆڕاندیان و خۆیان تەسلیمی ئاگری دۆزەخ کردو بە کافری مردن، بەڵام (روقیە)ی گەنج و لاو کچی (خەدیجە)ی پاك وگەورە (رەزای خوای لەسەربێت)، سەرکەوت و بردیەوە کە دواتر شوی بە (عوسمان)ی کوڕی عەفان کرد. بەو پیاوە خواپەرست و بەڕێزە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پیرۆزبایی لێ کردن. ئەو ئافرەتانەی کە لە رۆژی بووك گواستنەوەدا ئامادەبوون دەیان وت: أحسن شخصين رأی إنسان رقية وبعلها عثمان

واته: باشترین کەسمان دیت لە مرۆڤ، روقیەو مێردەکەی عوسمان.
پاشان خودای گەورە لە سورەتی (نور) دا دەفەرموێت: ﴿الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ والطَّيبونَ للطَّيبات﴾(النور:٢٦).

واته: ژنانی ناپاك بۆ پیاوانی ناپاك و پیاوانی ناپوخت بۆ ژنانی ناپوخت، ئافرەتانی پاکیش بۆ پیاوانی پاك و پیاوانی پاکیش بۆ ئافرەتانی پاك.

(ئوم جەمیل)ی پیس بۆ (ئەبو لەهەب)ی پیس بوو، (روقیە)ی پاکیش بۆ (عوسمان)ی پاك بوو. (خوا لێیان رازی بێت).

با سەرنج بدەینە ئەم ئایەتانە: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا(٨٧)﴾(النساء).

واتە: جا کێ هەیە قسەو گوفتاری لە فەرمایش و فەرموودەی خوا راستترو دروستتر بێت؟

﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلاً(١٢٢)﴾(النساء). واتە: جاکێ هەیە راستترو دروستتر لەخوا بەڵێنی خۆی بباتە سەر؟

﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ(١٢٨)﴾(النحل). واتە: بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە خۆیان پاراستووە لە گوناهو هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارو چاکە خوازن.

(روقیە)و(عوسمان) ئەم ژن ومێردە پاك وباشە ژیانێکی بەختەوەریان بردەسەر، منداڵێکیان بوو، ناویان لێنا (عەبدوڵلا) ئەم منداڵە لە تەمەنی (٦)ساڵیدا کەڵەشێرێك بە دەنووك لە چاوی داو تووشی وەرەمی کرد، بەهۆیەوە نەخۆش کەوت و دواتر مرد.

قورەیشییەکان دەستیان کرد بە ئازاردانی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو موسڵمان بوون، ئازاری زۆریان پێگەیاندن وجۆرەها سزایان بەلاشەو دەروونیان دەگەیاندو زۆر بێ ویژدانانە لە گەڵیاندا دەجووڵانەوە. موسڵمانەکان و پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) زۆر

لەدەستیان بێزار بوو بوون، بەلاَم چارەیەکیان نەبوو، نەیان دەزانی چی بکەن. چۆن خۆیان لە دەستیان رزگار بکەن، بۆ شوێن و پەنایەك بـچن و لەوان دوورکەونەوە.

## کۆچ کردن بۆ حەبەشە

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) رێگای بـە هاوەڵـەکانی دا کـۆچ بکەن بۆ ولاَتی حەبەشە، تاوەکو بتوانن بە ئازادی خواپەرستی خۆیـان ئەنجام بدەن.

موسڵمانەکان رویـان کـردە حەبەشـە کـە ژمارەیـان بـەپیاو ژن و منداڵەوە (١٥) یاخود (١٦) کەس بوون، (عوسمان)و(روقیـە) (رەزای خوایان لەسەربێت) لـەنێو کۆچـەبەرەکاندا بـوون. ئـەو کاتـە ولاَتـی حەبەشە پاشایەکی دادپـەروەری تێـدابوو، بـەناوی (نەجاشـی)، زۆری لەکەس نەدەکردولەگەڵدا باش بوو.

جارێکی تر (خەدیجە) تاقی دەکرێتەوە بە دورکەوتنەوەی کـچەکەی لەگەڵ زاواکەی بۆ ولاَتێك هیچ خزم وکەسێك وناسیارێکی لێ نییە ، جا دەبێ باری دەرونی ( روقیە ) چـۆن بێـت ، لەکاتێکـدا لـە دایـك وباوکی دوردەکەوێتەوە ، مەککەی خۆشەویست جێ بهێڵێت وبـاوك ودایکی جێ بهێڵێت ، لەکاتێکدا خەڵکی شاری ( مەککە ) هەموویان دژایـەتی بـاوکی دەکـەن وهـەردەم بـاوکی لـە ژێـر هەڕەشـەی بـێ

باوەرەکاندایە ، خزمەکانیان پێش ئەوانی تر هەرەشەی کوشتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکەن.

دەبێ چەند ناخۆش بێت، کاتێك مرۆڤەکان بەهۆی زوڵم و ئازاردانیان لە خۆشەویستان و نیشتیمانیان دوور دەکەونەوە، یان بۆ ئەو دایك وباوکانەی لە جگەرگۆشەکانیان دادەبڕێن بەهۆی ستەمی مرۆڤە خراپکارەکانەوە.

کاتێکی زۆر ناخۆش و پڕ ئازار بوو ، بۆ پێغەمبەر و (صلی الله علیه وسلم) بڕوادارەکان ، کە نەدەزانرا چی بەسەر ئەم بڕوادارانە دێت.

دەبێت لە دوورکەوتنەوەو جیابوونەوەی خۆشەویستان ناخۆشتر هەبێت؟! فرمێسك لە چاوەکان دەهاتنە خوارەوە، دڵەکانیان لە ناخەوە دەکوڵا و نەیاندەتوانی دان بەخۆیاندا بگرن و فرمێسك نەڕێژن. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی کرد بە دوعاو پاڕانەوە لە بارەگای خودای گەورەدا، داوای لە خودای گەورە کرد، کە هەموو بڕوادارەکان بپارێزێت، بەتایبەت ئەم کۆمەڵە کەسەی خۆیان ئامادەکردووە بۆ کۆچ کردن، لە دەستی ستەم رادەکەن وئامادەنین ملکەچی ستەمکاران بن، وەك ئەوان خوانەناس بن و بە نەفامی بژین.

ئەم بەڕێزانەی لەجاری یەکەمدا کۆچیان کرد بۆ حەبەشە بریتی بوون لەمانە: (زوبەیری کوڕی عەوام)و(موسعەبی کوڕی

عومەیر)و(ئەبوسەلمە)و خێزانەکەی (ئوم سەلمە)و (ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبە)و (سوهەیلە)ی خێزانی، و (جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب)و خێزانەکەی (ئەسمای کچی عومەیس)و(عوسمان کوڕی عەفان)و(روقیە)ی خێزانی (رەزای خوایان لەسەربێت)...هتد

موسڵمانەکان گەیشتنە (حەبەشە) شتی باشیان لە (نەجاشی)ی پاشای ئەو وڵاتە بینی. (نەجاشی) پێشوازی لێکردن و بە پیاوەکانی راگەیاند، کە باشترین هەڵسوکەوت لەگەڵ کۆچەرییەکاندا بکەن و رێزیان لێ بگرن، رێگای گرت لەهەموو کارێکی ناشیرین بەرامبەریان بکرێت، سزایەکی گەورەی دیاریکرد بۆ کەسێك ئازاریان بدات، بۆیە قەشەکان، ئەم پێشوازییەی نەجاشیان بۆ کۆچبەرەکان پێ ناخۆش بوو. قورەیشییەکان وەفدیان نارد، لەگەڵ دیارییەکی زۆر، بۆ (نەجاشی) پاشای (حەبەشە) تاوەکو کۆچبەرەکانیان بداتەوە، چونکە بە (نەجاشی) یان وت: ئەمانە لە قەومی ئێمە رایانکردووەو وازیان لە ئایینی باب و باپیرانیان هێناوە.

(نەجاشی) داواکەی ئەوانی رەتکردەوە، کە یەکسەر بیان داتەوە، تاکو نەزانێت میوانەکانی داوای چی دەکەن، کۆچبەرەکانی بانگکردو کۆی کردنەوە کە (جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب) نوێنەریان بوو، هات بەرامبەر (نەجاشی) وەستاو (نەجاشی) هەر پرسیارێکی لێی دەکرد ئەو وەڵامی دەدایەوەو راپۆرتێکی بۆ (نەجاشی) خوێندەوە. (نەجاشی) کاتێ

زانـی موسـڵمانەکان لەسـەر هـەقن و قورەیـشیەکان لەسـەر ناهـەقن وسـتەمیان لێ کـردوون، وەفـدی قورەیـشیەکانی دەرکـردو دیـاری یەکانیانیشی پێدا ناردنەوە.

نوێنـەری قورەیـشیەکان کـە بینیـان (نەجاشـی) پـشتگیری لــە موسـڵمانەکان دەکـات و رێـزی ئەوانیـشی نـەگرت، بـە ناچـاری و سەرشۆڕی گەڕانەوە ( مەککە).

(نەجاشی) بە (جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب) و هاوەڵەکانی گوت: ئێوە لێرە دڵنیابن، ئەگەر چیایەکم لە زێڕ بدەنێ ناهێڵم یـەك پیـاو لـە ئێوە ئازار بدرێت.

کاتێك موسڵمانەکان گوێیان لە وتەکانی (نەجاشـی) بـوو، دڵیـان خۆش بوو، دڵنیاش بوون کـە ترسـی دوژمنـەکانیان نـەماوەو ئـیتر بـە ئازادی لەو وڵاتەدا دەژین، هەسـتیان کـرد بـەهێز بـوون، کـە پێـشتر هەستیان بە لاوازی خۆیـان دەکـرد. دادگـەری پاشـا زۆر دڵخۆشـی کـردن، سوپاسـی زۆری (نەجاشـی) یـان کـرد، بـۆ ئـەو بڕیـارەو ئەوهەڵوێستە راست و جوانەی دەرهەق بەوان ئەنجامی دا، دەرکردنـی دوژمنەکانیان و نواندنی هەڵوێستێکی مەردانـە بەرامبـەر دوژمنـەکانی ئایینی خودا.

هەواڵ نەبوو، لەنێوان (حەبەشە)و شاری (مەککە)دا، کۆچبەرەکان ئاگایان لە کەسوکاریان و ئیماندارانی شاری مەککەدا نەبوو، پێغەمبـەر

و (صلى الله عليه وسلم) موسڵمانەکانی تر هەواڵێکی کۆچبەرەکانیان نەدەزانی و نەیان دەزانی هەواڵیان چی یە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خەدیجەی خێزانیدا زۆر بیری کچەکەیان و عوسمان و موسڵمانەکانی تریان دەکرد، ئەگەر هەواڵێکیش هەبێ و ببیستێ، وەك ئەوە نیە کە بەچاو دەیبینی. وەکۆچبەرەکان هەردەم چاوەڕوانی هەواڵی شاری مەککەیان دەکرد، تاکو بزانن، شاری مەککە چۆنەو پێغەمبەرو موسڵمانەکانی تر حاڵیان چۆنە.

## گەڕانەوەی بەشێك لەئیمانداران بۆمککە

رۆژێك، پیاوێك هاتە حەبەشە، کە خۆشترین هەواڵی بە کۆچبەرە موسڵمانەکان دا، ئەوانیش باوەڕیان پێی ی کرد.

هەواڵەکەش هەواڵێکی گەورەو دڵخۆشکەربوو، کە موسڵمانەکان زۆر دڵیان پێی خۆش بوو، ئەویش موسڵمانبوونی خەڵکی (مەککە ) وە موسڵمان بوونی (عومەری کوڕی خەتاب ) و (هەمزەی کوڕی عبدولموتەلیب ) دەکرێ بەهۆی ئەوانەوە خەڵکانێکی زۆر بێنە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە. کافرەکانیش نەتوانن بەو شێوەیە چیتر ئازاریان بدەن. بۆیە کۆچبەرەکان ئارەزووی گەڕانەوەی شارەکەی خۆیان کرد، بۆ ئەوەی شاد ببنەوە بە دیداری کەسوکاریان و

پێغەمبەری پێشەوا (صلی الله علیه وسلم) بـە تایبـەتیش روقیە)و(ئیمامی عوسمان) خوایان لێ رازی بێت.

بۆیە هەندێك لە كۆچبەرەكان بڕیاریاندا بە گەڕانەوەیان بـۆ شـاری (مەككـە). لـەنێو كۆچـبەرە گـەڕاوەكان (روقیـە)و(عوسمـانی كـوڕی عەفان)ی هاوسەری لەگەڵدابوو. پێش ئەوەی بگەنەوە شاری (مەككە) بینیان هێـشتا نێـوانی موسـڵمانەكان و قورەیـشیەكان ناخۆشـە، بۆیـە كۆچبەرەكان نەیاندەزانی بچنەوە (حەبەشە) یاخود بگەڕێنەوە ناوشاری (مەككە) و لەنێو موسڵمانەكاندا بمێننەوە.

(روقیە)و(عوسمان)ی هاوسەری ئەوان یەكـسەر بڕیـاری هاتنـەوەی ناوشاری مەككەیاندا، چـونكە جیابوونـەوەی خۆشەویـست وئـازیزان ئاسان نیە.

## دووباره كۆچكردن بۆ ( حەبەشە )

كاتێك قورەيشيەكان زانيان موسڵمانەكان گەڕاونەتەوە بۆ شاری (مەككە)، دەستيان كردەوە بە ئازاردانيان، (روقيە)و (عوسمان)ی هاوسەری ئارامێكی زۆريان گرت، چونكە نزيك بوون لە پێغەمبەر و (صلی الله عليه وسلم) (خەديجە)ی دايكی ئيمانداران، گرنگترين قوربانيانندا.

قوريشی يەكان فشاری جەستەيی ودەرونی زۆريان دروست كردبوو،لەسەر بڕواداران كە دان بەخۆداگرتنی زۆری دەويست، كاتێ بە شێوازی زۆر نامرۆڤانە موسڵمانەكانيان ئازار دەدا، بۆيە موسڵمانەكان ناچاربوون دووباره بگەڕێنەوە ولاتی حەبەشە، واتە:( بۆ جاری دووەم دەستيان كرد بە كۆچكردن).

زياتر لە ئايينی پيرۆزی ئيسلام تێدەگەيشتن و موسڵمان دەبوون، واتە:( تا دەهات ژمارەيان زيادی دەكرد)، موسڵمانەكان بەردەوام بوون لە ئارامگرتن ، بەرامبەر ئەو هەموو ئازارو ئەشكەنجە زۆرەی بێ باوەڕان. پێغەمبەر (صلی الله عليه وسلم) فەرمووی: روقيەو عوسمان يەكەم كەس كە كۆچيان كردبێ لەپاش حەزرەتی (لوط) و حەزرەتی (ابراهيم) (سەلامی خوايان لەسەربێت).

(خەديجە)ی دايكی (روقيە) نەيدەزانی ئيتر جارێكی تر چاوی بەكچە خۆشەويستەكەی ناكەوێتەوە، ئەمە دوا بينينيانە لەم جيهانەدا.

(خەدیجە) لەخەمی دوورکەوتنەوەی کچە ئازیزەکەی دایە، نازانێت مەرگ مەودای نادات جارێکی ترکچە شیرینەکەی ببینێتەوە، بەڵکو مەرگ بۆ شوێنێکی تری دەبات، کە لەوێدا لە هەموویان دوور دەکەوێتەوەو کەس ناتوانێ یارمەتی بداو فریای بکەوێت، تەنها کاروکردەوە چاکەکانی خۆی نەبێت، لە دوای مردنی بەکەڵکی دێت.

لە سەفەری ئەم جارە روقیە جارێکی تر لە دونیا دایکی نابینێتەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە لەدەست دانی (خەدیجە) زۆر دڵتەنگ بوو، لەلایەکی تر (روقیە)ی کچی و (عوسمان)و ئیماندارەکانی تری لێ دوورکەوتونەتەوە لە (حەبەشە)ن و دەربەدەرن، کێ بەرگەی ئەو هەموو خەمە زۆرە دەگرێت، لەکاتێکدا بە بەردەوامی لەلایەن بێ باوەڕەکانیشەوە ئازاری زۆر دەدرێت، بەڵام ئەوەی ئومێدو هیوای بوو، دڵی خۆش دەکرد، رۆژ لەداوی رۆژ خەڵك زیاترلەئاینی پیرۆزی ئیسلام تێدەگەیشتن وموسڵمان دەبوون ،واتە تادەهات ژمارەیان زیادی دەکرد.

## دووبارە گەڕانەوەی کۆچبەرەکان بۆشاری مەککە

لەناوشاری (مەککە) ، ئاژاوەش لەناو (حەبەشە )پەیدا ببوو،بۆیە کۆچبەرەکان بڕیاری هاتنەوەیان دا بۆناو شاری (مەککە ) .

کاتێك گەیشتنەوە جێ (روقیە) لەگەڵ (عوسمان)ی هاوسەریدا یەکسەر چوون بۆماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی

چاویان به پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم) ( خەدیجە) بکەوێت، بەڵام کاتێك (روقیە) چـووە ژوورەوە، تـەنها چـا وی بـە (ئـوم کەلـسوم)و (فاتیمە) کەوت، لەماڵەوە بـوون. (روقیـە) پرسـیاری دایـك وبـاوکی کرد، لە کوێن؟

(ئوم کەلسوم)و (فاتیمە) وەڵامیان دایەوە، کە باوکیـان چـووە بـۆ پێـشوازی موسـڵمانە کۆچـبەرەکان، لـە وەڵامـی پرسـیار دەربـارەی دایکیان، (ئوم کەلـسوم)و (فاتیمـە) دایانـە پرمـەی گریـان ، (روقیـە) تێگەیشت کە دایکی نەماوەو وەفاتی کردووە، (روقیـە) لـەم بـاوەڕەدا نـەبوو لـەم کاتـەدا گـوێی بـە ووشـەی مردنـی دایکـە پـاك و خۆشەویستەکەی بزرینگێنیتەوە، وتی: ﴿إِنَّـا لِلَّـهِ وَإِنَّـا إِلَيْـهِ رَاجِعُـونَ﴾ ئارامی گرت و رازی بوو بە قەزاو قەدەری خودا، بە گریانێکی بەسۆز بۆ دایکی گریا، لە دەروونەوە بۆی دەکولا، (زەینەب)ی خوشکی لـە ماڵی مێردەکەی (ئەبو عاص) بوو لە (مەککـە) دواتـر هـات، هـەموو خوشکەکان بەیەکتر شادبوونەوە.

(روقیە) رووداوی خۆی وئیماندارانی بۆ خوشـکەکانی گێڕایـەوە، لەم کۆچەی کردبووی بۆ وڵاتـی حەبەشـە، خوشکەکانیـشی رووداوە ناخۆشـەکانی (مەککـە) یـان بـۆ گێڕایـەوە کـە بەدەسـتی کـافرو بتپەرستەکان دیبوویان، گفت وگۆکانیان تەواو بـوو کاتێـك پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) گەڕایـەوە مـاڵ ، ئـەم دیمەنـە پڕبـوو،

لەخۆشەویستی وسۆزو لەباوەش گـرتن، کـە ماوەیـەکی زۆرو دوورو درێژە، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلـم) لە (روقیە) دابڕابوو، (روقیـە) هەرگیز رووی باوکی ئەوها بەخـەمناکی نـەدیتبوو و، هەسـتی کـرد ، مردنــی دایکــی تـەواو کــاری لــە خۆشەویــست (صــلی الله علیــە وسلـم)کردووە، (روقیە) شانبەشانی باوکی راوەستا بۆ ئەوەی پاڵپشتی تەواوی بکات و کەمێك لــە خەمـەکانی لێ کـەم بکاتـەوەو، هەنـدێك خۆشی بخاتە دڵ ودەروونی خۆشەویست (صلی الله علیە وسلـم).

## کۆچکردن بۆ (مەدینە)

بتپەرســـت و بــێ باوەڕەکــان بــەردەوام بــوون، لــە ئــازاردانی موسڵمانەکان و پێغەمبــەر (صــلی الله علیــە وســلم)، بــە بــەردەوامی ئازاری جەستەیی و دەروونیان دەدان.

پێغەمبەر (صلی الله علیە وســلم) ڕێگایـدا بـە ئیمانـداران، کـۆچ بکەن بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، بۆلای ئیماندارەکانی ئەوێ.

بۆئەوەی ئیمانداران لەدەست ستەمی گـاوران رزگاریـان بێـت و لەوێ بەئازادی خواپەرستی خۆیان بکەن وکار بە بەرنامـەی (قورئـان) بکەن، ئیمانداران تاك تاك وجۆت جۆت کۆچیان کرد، بـەرەو شـاری مەدینە، لەپێش هەموویاندا (روقیە)و(عوسمان)ی هاوسەری ، لەوێـشدا (ئەنصار)ەکانی خـەڵکی (مەدینـە) زۆر بـە گـەرم وگـوڕی و ڕێـزەوە

پێشوازیان لیّ کردن، دواجار پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ (ئەبوبەکر)ی هاوەڵیدا کۆچیان کرد.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆشەویستی و برایەتیەکی پتەوی لەنێوان ئەنصارو کۆچبەرەکاندا دروست کرد، تاك ومالّی خۆیان بەیەکتر بەخشی. ئەنصارەکان لەمالّی خۆیان ئەبەخشییەوە وئەیاندا بەکۆچبەرەکان. خودای گەورە لەبارەی ئەنصارەکان دەفەرمووێت:﴿ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلاَ يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ(٩)﴾(الحشر).

واتە: ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دلّ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلییەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوەو بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزلّی ئەوان دەدەن بەسەرخۆیاندا هەرچەند هەژارو نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی رەزیلی بپارێزێت و زالّ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.

(روقیە)و (عوسمان کوڕی عەفان)ی مێردی جێگای رێزێکی زۆر بوون لەم کۆچکردنەدا، چونکە سیّ جار لەسەریەك نیشتمان وخۆشەویستەکانیان بەجێهێشتبوو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خودای

گەورە، جیهاد کردن بوو لە پێناوی خودای گەورە،وە خودای گەورە پاداشتی چاکەکاران لەبیر ناکات.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ (ئەبوبەکری صدیق) (خـوا لێی رازی بێـت) لـە مەککـەوە بـەڕێ کـەوتن بەرەوشـاری(مەدینـە) لەریگادا چوونە نـاو ئەشکەوتێك،بۆخۆحەشـاردان لەبـەربێباوەڕەکانی (مەککە) کەبەدوایانەوەبوون. هەر لەو ڕۆژەدا بوو خێزانی (ئەبوبەکر)، (سـەودەی کـچی زومعـە) وەفـاتی کـرد، یەکـەم ئافرەتێـك بـوو لـە ئیمانداران دوای (خەدیجە ) وەفاتی کرد.

پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) دوای گەیـشتن بـۆ مەدینـە نوێنـەرێکی نـارد بـەدوای کـچەکانی (ئـوم کەلـسوم) و (فاتیمـە)دا، کەلەلای کەسوکاری لەوێ بەجێ مابوون، (ئەبوبەکر)یش (خـوا لێـی رازی بێت) (عبداللە)ی کوڕی نارد بۆ ئاگادارکردنەوەی کەسـەکانی و بیانهێنێ، (عەبدوڵلا) لەگەڵ (عائیشە) خوشـکی (خـوا لێیـان رازی بێت) کۆچیان کرد بۆ مەدینە.

## ( روقیە ) دەبێ پشوو بدا

( روقیە) کۆچی دوایی کردنی دایکی ، زۆر کـاری تـێ کردبـوو، وەکو برینێـك بـوو بـۆی و ئـازاری پێـی دەخـوارد، هـیچ دەرمانێـك چارەسـەری نـەدەکرد، ئـەوەبوو نـەخۆش کـەوت و تووشـی ئـازاری

زۆربوو. کاتێك پێغەمبەر (صلى الله علیه وسـلم) بـانگی ئیمانـدارانی کرد، بۆ شەڕکردن لـەگەڵ بێ باوەڕانی (مەککە)دا، (عوسمـانی کـوڕی عەفان) خۆی ئامادەکردو خۆی بەیەکەم سەرباز دادەنا بـۆ شـەڕکردن لـەگـەڵ هاوەڵدانـەرەکان، بـەلاّم پێغەمبـەر (صـلى الله علیـه وسـلم) فەرمانی پێدا کە ئەو بەشداری شەڕ نەکات بەڵکو چاودێری (روقیە)ی خێزانی بێت وشەونخوونی لـەگەڵدا بکات. (عوسمـانی کـوڕی عـەفان) هیچی بۆ نەکرا تەنها گوێڕایەڵی کردنـی فـەرمانی پێغەمبـەر(صـلى الله علیه وسلـم) نەبێت.

( روقیــه ) رۆژ لــەدوای رۆژ لاوازتــرو تەنگەنەفەســتر دەبــوو. (عوسمانی کوڕی عـەفان) (رەزای خـوای لەسـەربێت) زۆر سـکی بـە (روقیە)ی خێزانی دەسووتا و سۆزو خۆشەویستی تایبەتی بۆ دەردەبڕی ، (روقیە) تواناو هێزی لەبەردا نەمابوو، تەنها دوعای دەخوێندو لـەبـەر خودای گەورە دەپاڕایەوە.

شەڕی (بەدر) دەستی پێکرد، هەر لـەسەرەتای شەڕەکەداو لە یەکەم ساتدا (عوتبەوشـیبه ی کـوڕی رەبیعـه) و ( وەلیـدی کـوڕی عوتبـه) بەدەستی شێری خودا (هـەمزەی کـوڕی عبدالموتـەلیب)و سوارچـاکی موسڵمانان ( عەلی کوڕی ئەبو تالیب) بەماوەیەکی زۆرکەم کـوژران ، سەری (ئەبو جەهل) یش بڕا کە گەورەترین دووژمنی خوداو پێغەمبـەر (صلى الله علیـه وسـلم) بـوو، بەدەسـتی (عبـدالله کـوڕی مـسعود)

کوژراو (بیلال کوڕی رباح) کە بانگدەری پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) بوو، (ئومەیەی کوڕی خەلەف)ی کوشت.

پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) پەنای برد بۆ خودای گەورە کە یارمەتیان بدات، لەسەرکەوتنیان، ئەوەبوو، خودای گەورە بەسەرکردایەتی فریشتەی خۆی حەزرەتی جبریل هەزار فریشتەی رەوانەکرد، بۆ یارمەتی موسڵمانان، خودای گەورە لە سورەتی (الأنفال) دا دەفەرموویت: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنْ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ(٩)﴾ واتە: (یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە لە پەروەردگارتانەوە دەپاڕانەوەو داوای یارمەتیتان لێ دەکرد، خوایش خێرا هات بەهاناتانەوەو فەرمووی: بەڕاستی من بە هەزار فریشتەی تر یارمەتی و کۆمەکیتان دەکەم بە شوێن ئەوانی تردا.

گۆڕەپانی شەڕ پڕبوو لەلاشەی هاوەڵدانەرو و بێ باوەڕاندا، پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) فەرمانی بە ئیمانداران کرد، کە لاشەکانیان بشارنەوە، لە ( بە در). کاتێك لاشەی (ئومەیەی کوڕی خەلف)یان هەڵگرت ،لاشەی دارزابوو، پارچە پارچە ببوو، بۆیە لەشوێنی خۆی بەجێیان هێشت و بەردیان لەسەر کەڵەکە کرد، تا لاشەکەی بزربوو. بەڵێنی خودای گەورە دێتەجێ لەکاتێکدا بەڵێنی سەرکەوتنی بە موسڵمانان داوە ، ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ

الْمُؤْمِنِينَ(٤٧)﴾(الروم). واته: (ئەوسا ئیتر سەرخستنی ئیماندارانی بە ئەرکی سەرشانی خۆمان زانی و سەرکەوتنمان پێ بەخشین).

خودای گەورە بە فریشتە پیرۆزەکانی یارمەتی موسڵمانانی دا تاسەریان بخات ، لەپێش هەموو فریشتەکانیش حەزرەتی (جبریل)،(سەلامی خوای لەسەر).

شەڕ کۆتایی هات و تەم ومژی شەڕ نەما، پێغەمبەرو هاوەڵەکانی بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە، ئالاّی سەرکەوتن لەسەر سەریان دەشەکایەوە ، بە هەموو دەنگی خۆیان تەکبیریان لێدەداو دەیانگوت (الله اکبر، الله اکبر) و سوپاسی خودای گەورەیان کرد، بۆ ئەو دەستکەوتەی کە خودای گەورە بەڵێنی پێدابوون، بەڵێنی خۆی هێنایە جێ و سەرکەوتنی بۆ مسۆگەرکردن. دەنگی باوەڕداران بە بەردەوامی دەهات و (الله اکبر الله اکبر) یان دەوت ، بەرەو ناو شاری (مەدینە) دەگەڕانەوە ، لەوکاتەدا لێوەکانی (روقیە)ی نازداری کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و خێزانی (عوسمانی کوڕی عەفان) (خوا لێی رازی بێت) شەهادەی دەهێناو دەیگوت:(( أشهد ألا إلـه إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله ))، بەردەوام بوو تاکو وەفاتی کردو گیانی پاکی سپارد، لە گەڵ هاتنی یەکەم مژدەی سەرکەوتنی موسڵمانان لە شەڕی ( بەدەر)، خاتوو ( روقیە ) گیانی پیرۆزی سپاردە خالقی گەورە. (عوسمانی کوڕی عەفان) بۆ ئەم خێزانە بەوەفاو خۆشەویست و دڵسۆزەی

فرمێـسك لـه چـاوەكانی هاتنـەخوارەوە و، ووتـی: (إنـا لله وإنـا إليـه راجعون). كاتێك (خەديجە)ی پاك وەفاتی كرد، (روقيه) لەلای دايكـی نەبوو، لەبەر ئەوەی لە (حەبەشە) بوو، دايكی لـەدووری ئـەو سـەری نايەوە، ئەمڕۆش كە ئەو لـەسەرە مەرگدابوو، وەفاتی كـردووە، بـاوكی لەلا نيە. مەگەر هەموويان لە ڕۆژی قيامەت و لەسەر حەوزی كەوسەر بەيەك شاد دببـەوە، بـە پـشتيوانی خـوا. وەفـاتی ( روقيـه) لـە سـاڵی دووەمی كۆچی بوو. (عوسمان) پرسياری كرد لە پێغەمبـەر (صـلی الله عليه وسلـم) پاداشتی من چيە لە جەنگی بـەدر؟! پێغەمبـەر (صـلی الله عليه وسلم) فەرمووی: تۆ بە يەكێك لە بەشدارانی جـەنگی ( بـەدر) دادەنرێيت.

ئـوم كەلـسوم (ڕەزای خـوای لەسـەر بێـت) کـچی سـێیەمی پێغەمبەر(صلی الله علیـه وسـلم) بـوو، لـه (خەدیجـه) ، ئـەویش وەك کچەکانی تری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە ماڵی پێغەمبەرایەتی پەروەردە کرابوو، لەسەر پاکی وحەیاو تـەقواو خـودا پەرسـتی. کـاتێ پێگەیشت لەلایەن خزمەکانی یەوە خوازبێنی کرا، کە ئەو کاتە هێـشتا ئایەت دانە بـەزیبوو، پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) پـەیامی بـۆ نەهاتبوو.

لـە نمـایش کردنـی ژیـانی روقیـە (ڕەزای خـودای لەسـەر بێـت) تیشکمان خستە سـەری بۆیـە پێویـستی بـە دوبـارە بونـەوە نیـە. وەك خوازبێنیان لە لایەن مـامی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم)( ئـەبو لەهەب)و (ئەبو تالیب) چوونە لای پێغەمبـەرو خـوازبێنی (روقیـە)یـان کرد بۆ (عوتبە) و(ئوم کەلسوم) بۆ (عوتیبە)ی کوڕانی (ئـەبو لەهـەب ). دواتریش روداوەکە بەرەو کوێ چوو، چیان بەسەر هات.

(ئەبولەهەب) و (ئوم جەمیل) تا دەهات زیاتر ئـازاری پێغەمبـەریان (صلی الله علیه وسلم) دەدا، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسـلم) زیاتر موکوڕتر دەبوو ، تا دەهات بەهێزتر دەبوو، لە بانگەوازەکەیدا.

دواتر بانگەوازەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سـەرکەوت هەرچەند نموونـەی وەك (ئەبولەهـەب و ئـوم جـەمیل و ئـەبو جـەهل)

تەگـــەرەیان دەخـــستە ســـەر رێگـــای بانگەوازەکـــەی بـــۆ ئـــەوەی سەرنەکەوێت.

ئەو کەسانەی کە لە رەحمەتی خودای گەورە بـێ بـەش کرابـوون، هەردەم خەریکی ئاژاوە نانەوەو دوژمنایەتی پێغەمبەر (صـلی الله علیـه وسلـم) بوون، جۆرەها نەخـشەو پیلانـی پیـسیان دادەنـا لـە دژایـەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

(ئەبو لەهەب) بە (عوتەیبە)ی کوڕی گوت: رووت لە مـن حـەرام بێ تا نەچی بە لای (محمد) و کچەکەی تەلاق نەدەی.

پێش ئەویش (عوتبەی) کـوڕی نـاردبوو، بـۆ تەلاقـدانی (روقیـە)، (عوتەیبـــە) لەســـەر قـــسەی بـــابی و دایکـــی هەڵـــسا چـــووە لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کە خەڵکی لە چواردەوری بوو، پێـی وت: ئەوە کچەکەتم تەلاق داو، کوفر دەکەم بە دینەکەی تۆ، وازم لـە کچەکەت هێنا، نەمنت خۆش بوێ و نەمنیش تۆم خۆش دەوێ، پاشان پەلاماری پێغەمبەری داو کراسەکەی دڕاندو لەبەری کردەوەو تفـی لێ ی کرد.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەرامبەر بەوکردەوەی دوعای لێ کردو فەرمووی: (اللهم سلط علیه کلباً من کلابك).

واته: ((خودایه سەگێك لە سەگەكانی خۆتی بەسەردا زاڵ بکـە)).
(ئەبو تالیب) لەوێ بوو، ئەم دوعایەی پێ ناخۆش بوو، زانی دوعاکەی قەبوڵە، بە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) ووت: چیت کرد؟!.

ئینجا ( عوتەیبە) گەڕایەوە لای باوکی، باوکی لێی پرسی: عوتەیبە چیت کرد؟

ئەویش ڕووداوەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە، کە چی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردووەو ئوم کەلسومی کچی تەلاق داوە.

ئەبولەهەب ووتی: ئەو چۆن وەلامی دایەوە؟

عوتەیبە ووتی: دوعای لێ کردم و وتی: (( خودایە سەگێك لە سەگەکانی خۆتی بەسەردا زاڵ بکەی)).

باوکی ووتی: کوڕم باوەڕت بە دوعای (محمد) نەبێت.( ئەبو لەهەب) و ژنەکەی هەرچەندە زۆرتر ترسان لەم دوعایەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەلام بەسەر خۆیان نەهێنا.

(ئەبولەهەب) و(عوتەیبە)ی کوڕی لەسەر سەفەربوون، لەگەڵ کاروانچیەکانی تر کەوتنەڕێ بەرەو( شام)، لە ڕێگادا لایاندا شوێنێك، ( راهیبێك) سەرپەرشتی ئەو شوێنەی دەکرد، راهیبەکە چووە لایان و پێی گوتن ئەم شوێنە دڕندەی زۆری لێ یە، لە (شێرو کەمتیار) ئاگاتان لەخۆتان بێت، (ئەبولەهەب) ترسی دوعاکەی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) هەر هەبوو، کاتی نوستن شوێنێکی بەرزیان بۆ (عوتەیبە)

راخست. شەو شێرێك هات، یەك یەك بۆنی كردن، تا گەیشتە (عوتەیبە) دایە بەر كەڵبەو چڕنۆكان تاكو كوشتی.

هەندێك دەگێڕنەوە: شێرەكە (عوتەیبە)ی بردو سەری شكاند، كاتێ گەیشتنە لای دواهەناسەی داو ووتی: ئەی قوڕت بەسەر دایە، بەم خودایە ئەمە دوعای (محمد) بوو كاری لێ كردم، ئەو لە( مەككە) و من لە( شام ).

(ئەبولەهەب) هەستی كرد ئەویش لە دوعاكەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) رزگاری نابێت، بە تایبەت كە رووداوی كوڕەكەی بەچاوی خۆی بینی، بەڵام هێشتا هەر موسڵمان نەبوو، بەردەوام بوو لەسەر كەللە ڕەقیەكەی.

ئەم كارە چەپەڵەی (ئەبولەهەب و ئوم جەمیل) كە لەگەڵ كوڕەكانیان ئەنجامیاندا بە سوكایەتی كردن بە پێغەمبەرو(صلی الله علیه وسلم) تەڵاقدانی كچەكانی (ئوم كەلسوم و روقیە) ئازارێكی زۆری پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) دا. ئەم ئازارە نەك هەر بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بوو، بەڵكو بۆ گشت ئەندامانی خێزانەكەیان ناخۆش بوو، بە تایبەتیش بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و (خەدیجە)ی خێزانی ، ئازاری زۆریش بۆ (ئوم كەلسوم)و (روقیە) بوو.

(ئوم کەلسوم) دوای ئەوەی خۆی و ( روقیە)ی خوشکی لەلایـەن ئامۆزایەکانیان تەلاق دران، زۆر دڵ تەنگ بوو، دواتر ( روقیە) مێردی کرد بە ( ئیمامی عوسمان ) ولەگەڵ کۆچەریەکان چـوو بـۆ( حەبەشـە) ،(ئوم کلسوم) لەلای دایك وخوشـکە بـچوکەکەی (فاتیمـە) مایـەوە ودواتر لە گەڵ باوکی بە ڕێـزی وگـشت موسـڵمانەکان کەوتـە بـەر شـالاَوی دڕندانــەی هاوەڵدانــەرەکان، ڕۆژانــە ئاگــارداری ئــازارو ئەشکەنجەدانی خوشك وبرا موسڵمانەکانی بوو، لــەو لاشــەوە دایکـی هێدی هێدی باری تەندروستی خراپ دەبوو، ئەویش خزمەتی دەکرد ، دەیویست ئەو خزمەتکردنەی( روقیە) بۆ دایکـی دەیکـرد، ئـەو پـڕی بکاتەوە.بە تایبەت لە دولێی (ئەبو تالیب ) . دایکی بـاری تەندروسـتی خراپ بوو، ئەو کچە خۆ راگر وئارامگرە ڕۆژانە پێشوازی لە بـاوکی دەکرد وخزمەتی دایك وخوشکە بچوکە نازدارەکەی دەکرد.

لەکاتی کۆچی دوایی دایکە بەڕێز وپڕ سۆزەکەی ئامادە بوو، جگە لەوەی هەر چەند جاری باوکی بۆ گەیاندنی پەیامی خودا دەردەچـوو، ئەو دڵە خورپەی دەگرت ودەستی بە دوعاو نزا دەکرد تاوەکو خودای گەورە باوکی سەرکەوتوو بکات وبیپارێزێت.

ئەوە بوو دایکی وەفاتی کرد و( روقیە)ش لەلایان نـەبوو، ئـەویش فرمێسکەکانی دەباراندو سوپاسی خودای دەکرد. ( روقیە)کاتێ هاتەوە فرمێسکیان داباراند جـارێکی تـر لەگـەڵ خوشـکە کـۆچ بەرەکـەیان

کۆبونەوە وزەینەبیش هەردەم سەردانی دەکردن ، جا چۆن واناکەن لەکاتێك پەروەردەی دەستی پێغەمبەری خودان وقورئان لە ماڵی ئەوان دادەبەزیت..!!

## شوکردنی ( ئوم کەلسوم ) بە ( عوسمان کوڕی عەففان )

.پاش شەڕی (بەدر) مێردی (حەفسە)ی کچی (عومەری کوڕی خەتاب) (خوا لێیان رازی بێت) کە ناوی (خەنیس کوڕی حوزافە) بوو، پاش برینداری لە شەڕەکەدا، کۆچی دوایی کرد.

دواتر عومەری کوڕی خەتاب کە (حەفسە)ی کچی بێوەژن بۆوە، چووە لای (ئەبو بەکرو عوسمانی کوڕی عەففان) بۆ ئەوەی کچەکەی بخوازن.

بەلام (عوسمانی کوڕی عەففان) خوا لێی رازی بێت، وەڵامی (عومەری کوڕی خەتاب)ی نەدایەوە، کە (حەفسە)ی دەوێ یاخود نا، (ئەبو هورەیرە) رەزای خوای لێ بێت دەفەرمووێت: کاتی (روقیە) کۆچی دوایی کرد، (عوسمانی کوڕی عەففان) گریا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)فەرمووی: بۆ دەگری؟

(عوسمان) لە وەڵامدا وتی: لەبەرئەوەی لە تۆ دوور دەکەومەوەو تازە لە تۆ دادەبڕێم، واتە: ( لە زاوایەتی تۆ).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (جبریل - علیه السلام) پێی راگەیاندم کە بەفەرمانی خوای گەورە، خوشکەکەی لە تۆ مارە بکەم. هەروەها دەگێرنەوە: کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: "نیگام لە ئاسمان بۆ هاتۆتە خوارەوە، کە (ئوم کەلسوم) بدەم بە (عوسمان).

هاوسەرگیری (ئیمامی عوسمان )و (ئوم کەلسوم) دەگەرێتەوە بۆ ساڵی (٣)ی کۆچی. بەفەرمانی خودای پەروەدگار (ئیمامی عوسمان) بوو بە مێردی (ئوم کەلسوم).

(ئیمامی عوسمان) توانی قورئان کۆ بکاتەوە و، بیری (معونە )ی کڕی وتەرخانی کرد بۆ موسڵمانان بەبێ بەرامبەر، نوێنەری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بوو، لە ئاشتبوونەوەی (حودەیبیە) (صلح الحدیبیة)و، یارمەتی موسڵمانانی زور دەدا، زۆر کاری تری ئەنجامداوە. خۆشەویست بوو لەناو قورەیشیەکاندا، بۆیە قورەیشیەکان ئەیان ووت: (حبك والرحمن.. حب قریش وعثمان). وە بە ( ذا النورین) ناسرابوو، چونکە دوو کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاوسەری بوون، لە دوو کۆچکردندا بەشداری کردبوو، نوێژی لە دوو قیبلەدا کردبوو.

(ئوم کەلسوم) چووە لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)و وتی: مێردی فاتیمە باشترە لە مێردی من واتە:(ئیمامی عەلی).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو ((خـوداو پێغەمبـەری خـۆش دەوێ، خـوداو پێغەمبـەریش ئـەویان خـۆش دەوێ)). (ئـوم کەلسوم) بە باوکی ووت: مێردی من خوداو پێغەمبەری خـۆش دەوێ و خوداو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێ.؟

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (( بەڵێ، زیاتر ئەگـەر چوویتە بەهەشت، ئینجا شوێنی مێردی خۆت (عوسمـان) دەزانـی، کـە هیچ هاوەڵێکی من ئـەو شـوێنەیان نیـە، کـە ئـەو هەیـەتی، جـا (ئـوم کەلسوم) کچم چیت لـەوە باشتر دەوێ ؟! بۆئـەو بەختەوەریـەی کـە بەدەستهێناوە)).

دڵ باشی وکارە چاکەکانی (عوسمان) خوا لێـی رازی بێـت، مـرۆڤ سەرسام دەکات، لـە گوێڕایـەڵی یـەکانی بـۆ داواکاریـەکانی خـوداو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر ملکەچی داخوازی وفەرمانەکانی خوداو پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) بـوو، زۆر بـیری خـودای گەورەی دەکردو قورئانی دەخوێند، ئەوەندە رەوشـتی جـوان و باشـی هەبوو، ئەگەر لەبەر ئەوەی (روقیەو ئوم کەلسوم)ی کچی پێغەمبـەری (صلی الله علیه وسلم) لەلابووە، ناویان لێنـاوە (ذي النـورین)، ئـەی چەند نوور چاوەڕێی دەکات لە بەهەشتدا.

(ئوم کەلسوم) لە شەڕی (فتح الفتوح) لـە رزگـارکردنی شـاری مەککەدا چاوی گەش بووەوەو بە دیتنی بـاوکی، کـە بینـی (بتـەکان) دەشکێنێ تاکو (کەعبە)ی پیرۆز پاك بکاتەوە لە هاوبەشی بێ باوەڕاندا.

## وەفاتی ( ئوم کەلسوم )

(خوا لێی رازی بێت)

پاش تەمەنێکی پڕ تەقواو خودا پەرسـتی، (ئـوم کەلـسوم) نـەخۆش کەوت، لە مانگی (شەعبان)ی سـاڵی (٩)ی کۆچـیدا، نەخۆشـیەکەی هەراسانی کرد، لەناو جێدا کەوت، نەخۆشیەکەی توندو ئـازاردابوو، بەڵام لێوەکانی هەر بە یادی (خودا) دەجوڵاندەوە.

بەم نەخۆشیەی گـوێی لـە دەنگـی بـیلال بـوو، بـانگی بـەیانی دا، (عوسمان)ی مێردی نەی دەویست جێی بهێڵێ، بـەڵام خـودای گـەورە بانگی دەکات بۆ نوێژ، بە چاوێکی سۆزو بەزەیی یەوە تەماشـای (ئـوم کەلسوم)ی کرد، ئینجا بۆ نوێژی بەیانی کەوتەڕێ.

(ئوم عەیاش) گوێی لە هەناسـەکانی کۆتـایی بـوو، بـەرەو مـەرگ نزیك دەبۆوە، ناردی بەدوای (عوسمان)ی مێردی و پێی راگەیانـد کـە بێتەوە. (عوسمانی کوڕی عەففان) لە مزگەوت گەڕایەوە، پێغەمبـەر یـش (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵی دابوو، لەگەڵ (ئەبو بـەکرو عومـەرو عەلی)و هەندێکی تر لە یاوەرانی (رەزای خودایان لەسەر بێت).

(ئوم کەلسوم) فرمێسکەکانی دەهاتە خوارەوە، هیچ قسەیەکی نەدەکرد، تەنها ئەو وشانەی دەردەبڕی کە تەنیا خودای گەورە لێی رازی بێت، لە کاتی سەرە مەرگ ئەم چەند ئافرەتە لەلای بوون، (ئەسمای کچی عومەیس) و خێزانی (ئەبو بەکر) و(سەفیەی کچی عەبدولموتەلیب) و (فاتیمەی خوشکی) هتد ،چاودێری یان دەکرد ولە دیاری دانیشتبوون.

هەناسەبڕکەی پێ کەوتبوو، بەرەو مەرگ نزیك دەبۆوە، تاکو بەم جۆرە گیانی پاکی سپارد، ئامادەبووان دوعایان بۆ دەخوێندو فرمێسکیان بۆی رشت، لە (بەقیع)دا شاردیانەوە.

شەش ساڵ تەمەنی هاوسەرێتی لەگەڵ ئیمامی عوسمان بەسەر برد.

فاتیمە کچی چوارەمی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) بور ئەویش وەکو خوشکەکانی تری لـە خەدیجـەی خێزانـی پێغەمبـەرە (صـلی اللە علیە وسلـم).

(ئیمامی زەهەبی) لە ژیاننامەی پێغەمبەردا (صلی اللە علیە وسـلـم) دەڵێ:(فاتیمە لەپێش (بعثة) واتە (بەر لە دابەزینی نیگـا) بـە ماوەیـەکی کەم لەدایك بور، لەشاری ( مەککە) دا.وەلەریوایەتێکی تردا هـاتووە، دەڵێ:ساڵێك دوای دابەزینی پەیام لەدایك بووە ،واتە:ئەوکاتە تەمـەنی پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلـم) (٤١) ساڵ بوو .

(ئیبن حەجەر) دەڵێت: بۆیە نازنـاوی ((الزهـراء))ی پـێ بەخـشرا، چـونکە پـەروەردەکرا بـە پـەروەردەکردنێکی موسـڵمانانە، وەپـاکی لەدایکی وەرگـرت، وە پـەروەردەکراو بـەخێوکرا لەسـەر سـیفات و رەوشتێکی بەرز لەلایەن دایك و بـاوکی یـەوە، لەگـشت بوارەکانـدا شتەکانی بەباشی فێرکرا، ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەر نیە کـە منـداڵێك لە باوکێکی وەکو پێغەمبـەر (صـلی اللە علیـە وسـلم) و لـەدایکێکی وەکو (خەدیجە) ببێت ولەلای ئەوان گەشەی کردبێت، لە کاتێکدا ئەم دایك وباوکە پێشەوای پاکی و رەوشـت بـەرزی بـوون، بۆیـە خـوای گەورە دەفەرموویێت:﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَـانَ يَرْجُـو اللَّـهَ وَالْيَـوْمَ الآخِـرَ وَذَكَـرَ اللَّـهَ كَـثِيرًا(٢١)﴾ سـورەتی (الاحـزاب).واتـە: ( سـوێند بـەخوا بەڕاسـتی لـە پێغەمبـەری خـوادا

چاکترین نموونەی تەواو و ڕێك وپێك هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفیرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە وبەردەوام یادی خودا بەزۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو).

ئەوە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە هەرچوار کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەر لە پێغەمبەرایەتی لە دایك بوینە وئامادەی دابەزینی نیگا بوینە.

فاتیمە کچێکی زۆر زیرەك بوو، مێشکێکی فراوان و بیرێکی تیژی هەبوو، ئازاو بوێر بوو، چونکە لەگەڵ هەقدا بوو، بەڕەوشتە باشەکانی ناسرابوو.

## یارمەتیدانی فاتیمە بۆ باوکی:

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نیگای (وحی) بۆ هاتە خوارەوە، فاتیمە تەمەنی (٥) ساڵ بوو، لەگەڵ دایکیدا بەرەنگاری هەموو ئەو ناخۆشیانە دەبۆوە کە دەهاتە سەر ڕێگایان، دەیزانی ئامانەتێکی گەورە لەسەر شانیانە، لەگەڵ ئەوەی بەتەمن بچوك بوو بەڵام توانی هەموو دووژمنەکانی باوکی بناسێ. زۆر بەهێزبوو، بەرامبەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەی دەهاتنە سەر ڕێگایان، بە ورەیەکی بەرزەوە

بەرەنگاریان دەبووەوە، ملکەچی کوفر نەدەبوو، سوجدەی تەنها بۆ خودای گەورە دەبرد. لەو کاتەدا چەندان سوکایەتی وکاری نارێك وکردەوەی ناشیرین بەرامبەر باوکی و خانەوادەی ئەنجام دەدرا. بۆ نموونە: (ئەبو جەهل) لەگەڵ کۆمەڵەکەی کە کافرو بێ بڕوا بوون، دووجار جۆرێك لە جۆرەکانی سوکایەتی بەرامبەر بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەنجامیاندا ئەویش شتی پیسیان دەهێناو دەیان خستە سەر شان و پشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەکاتی نوێژکردن و لە سوجدەدا. دووجار هەڵسان بەم کارە ناشیرین و نارێکەی دوور لە خوو رەوشتی مرۆڤایەتی، پاشان گاڵتەشیان بە پێغەمبەری پێشەوا دەکرد. هەردوو جار (فاتیمە) بەگریان باوکی ئاگادار دەکردەوە، کە دەستەو تاقمی (ئەبو جەهل) ئەم کارە پیسەیان لە دژی باوکی کردووە، بەرگری لە باوکی دەکردو بە دەستەکانی پیساییەکانی لەسەر پشتی باوکیدا لادەبردو سەرشانی باوکی خاوێن دەکردەوە، وقسەی ناشیرینی بەو کەسە دەگووت کە بەم کارە پیسە هەڵساوەو سوکایەتی بە باوکی کردووە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتێ لەنوێژ دەبۆوە دەیفەرموو: ((اللهم علیك بقریش.. ثلاث مرات _ اللهم علیك بأبي جهل بن هیشام، وشیبه بن ربیعة وعتبة بن ربیعة، وعقبة بن معط)).

جارێکیان فاتیمە خۆی گوێی لێبوو کـە دەیانویـست لـە پێغەمبـەر (صلی الله علیـە وسـلم) بـدەن، فاتیمـە بـەگریان گەڕایـەوە ماڵـەوە بەباوکی ووت: دەیانەوێت بتکوژن.

پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسـلم) پێـی ووت: (کـچم مـەگری خودای گەورە ڕێگایان لێ دەگرێ).

پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) گەورەترین وبەهێزترین بیروباوەڕی بەخودای گەورە هەبوو، یاسایەکەش وایە هەر کەسـێ لەگـەڵ خـودای گەورە بێ، خودای مەزن پارێزگاری لێ دەکاو پـشتیوانی دەبـێ، هـەر کەسێکیش لەگەڵ خودای گەورە بێت نابێـت بترسـێ و دڵتـەنگ بـێ وچۆك دابدات.

فاتیمە بەم وەڵامانەی باوکی دڵخۆش بوو،بەبیری هاتـــــەوە باوکی پێغەمبەری خودایە، چـونکە مـرۆڤ لــە کـاتی ناخۆشـی تـەنگاو دەبێت وزۆر جار شت لە یاد دەکـات لـەژێر فـشاردا بـەڵام کاتێـك پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) قسەی دەکرد ئەوە جارێکی تر وشیار دەبویەوە، کـارێکی سروشتیـشە بەناخۆشـی یـەکانی بـاوکی دڵتـەنگ دەبوو، چونکە مرۆڤە ومەعـصوم نیـە تـەنیا کەسـێکی بـەڕێزی خـودا پەرستە. ( فاتیمە) گەڵێك نازدار بوو، وەك گـوڵ پـاك و بۆنـدار بـوو، دڵە ناسکە بچکۆلانەکەی زۆر جار بەرگەی ئەو سوکایەتی پێکردنـەی نەدەگرت کە بەرامبەر باوك و کەس وکارەکەی دەکرا، ناچـار پـەنای

بۆ گریان دەبرد. هەروەك دەگێڕنـەوە: جارێکیـان (فاتیمـە) لـە ڕێگـا بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە، (ئەبو جەهل) شەڕی پێ فرۆشـت وقـسەی پـێ گوت، فاتیمەش بە گریان ڕۆیشت تا گەیشتە (ئەبو سوفیان) کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو،( فاتیمە ) پێی ڕاگەیاند (ئەبو جەهل) ئەم کـردارە ناشیرینەی کردووە، (ئەبو سوفیان) تەحەمولی نـەکرد کـە بـەم شـێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم کچە بچووکە بکرێت و، قسەی ناشیرینی پێ بگوترێ، چوو لەپێش چاوی ( فاتیمە ) قسەی بە (ئەبو جەهل) ووت.

بەم قسە پێگوتنـەی (ئـەبو جـەهل) بـە (فاطیمـة) ابوسـوفیانی زۆر نارەحەت و تووڕە کرد. ( فاتیمـە) کـاتێ گەڕایـەوە لای بـاوکی ئـەم ڕووداوەی بۆ باوکی گێڕایەوە کە (ئەبو سوفیان) بەرگری لێ کردووەو قسەی بە (ئەبو جەهل) گووتووە، پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) فەرمووی :((اللهم لاتنسها لأبي سوفیان)). واتە: خودایە ئەم کردەوەی (ئەبو سوفیان) لەبیر مەکە. خودای گەورە داواکەی پێغەمبەری (صـلی الله علیە وسـلم) قـەبوڵ کـردوو سـینگی ئەبوسـوفیانی پـاك کـردەو لەگومان و دوو دڵی، (ئەبو سوفیان) دواتر هاتە ناو ئیسلام، دڵـی بـە باوەر ڕووناك بوییەوە، شرك و تاریکی لەناو دڵی (ئەبو سوفیان) نەما.

فاتیمە هەرچەند ئەو کاتە بچووك بوو، بەڵام خاوەنی بیرو باوەڕێکی گەورەو بەهێزبوو، مێشکێکی فراوانی هەبوو، لەهەموو ئەو کۆسـپ و

تەگەرانەی دەهاتنە سەر ڕێگای بـاوکی. فاتیمـە لەگـەڵ باوکیـدا بـوو وپشتگیری لیّ دەکرد، بۆیە کافرەکان زۆر ڕقیان لێی دەبۆوە.

پاش هەڵگرتنی ئابڵۆقە لەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسـلم) و موسڵمانان، (ئەبو تالیب)ی مامی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) کۆچی دوایی کرد، کە هەردەم پاڵپشتی بـەهێزی پێغەمبـەر(صـلی الله علیه وسلم) بوو، بە هەموو جۆرێك یارمەتی و پشتگیری دەکرد.

بە مردنی (ئـەبو تالیـب) پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) زۆر خەمبار بوو، دوای (٣) ڕۆژ (خەدیجە)ش بـە نەخۆشـی کۆچـی دوایـی کرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسـلم) و فاتیمـە وخوشـکەکانی زۆر خەمبار بوون بەمردنی ئەم دووە، بەتایبەتی کە ( ڕوقیـە )ی خوشـکیان کۆچی کردبوو ولەکاتی مردنی دایکی ئامادە نەبوو ، وەفاتی (خەدیجە) کۆسپێکی گەورەی خستە ناو خێزانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، بڕوادارانیش بەشداری ئەم خەمە گەورەیە بوون، بۆیە ئەم ساڵەیان نـاو نا ساڵی خەمباری (عام الحزن).

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) زۆر خەمبار بوو لەبەر ئەوەی ئـەم دووە زۆر یارمەتیان دەدا بـە بـەردەوامی، بـە تایبـەتی (خەدیجـە) هـەر لەسەرەتای هاوسەرێتی یەوە بە بەردەوامی یارمەتی دەداو زۆر وەفـادار بوو بۆی.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دوو کچەکەی (ئوم کولسوم)و (فاتیمە)ی بەجێهێشت و رۆیشت بۆ (تائیف). کاتێك گەیشتە (تائیف) خەڵکەکەی لەجیاتی بەدەم بانگەوازییەکەی بچن و موسڵمان بن، بە پێچەوانەی بانگەوازەکەی جولأنەوە، زۆر بە ناشیرینی هەڵسوکەوتیان بەرامبەری کرد، هەڕەشەیان لێ کردو ئیهانەیان کرد، بە منداڵان بەرد بارانیان کردو برینداریان کردو لەوێدا دەریان کرد.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوێ گەڕایەوە، بۆ شاری (مەککە) بۆ لای خاوخێزان و ئیمانداران، بەڵام بێ هیوا نەبوو لە رەحمەتی خوای گەورە، پاش ئەم هەموو ناخۆشیانەی هاتنە سەر رێگای. دوای ئەوناخۆشیانە خوای گەورە دڵی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) خۆش کرد،( فاتیمە) بە دڵ خۆشبوونی باوکی ئەویش دڵ خۆش بوو، ئەویش هەواڵ ودەنگ و باسی (مەدینە) بوو، ئەو خەڵکانەی لە( مەدینە) دەهاتن بۆ (مەککە) بە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) رادەگەیاند: کە خەڵکانێك لە ( مەدینە) ئیمانیان بەتۆ هێناوەو دەیانەوێ بێنە ناو ئایینی ئیسلام.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بە (موسعەبی کوڕی عومەیر) کرد، کە بچێ بۆ شاری (مەدینە) تاکو ئیسلام بۆ خەڵکی (مەدینە) رۆشن بکاتەوەو پێیان رابگەیەنێت و قورئانیان فێربکات.

(موسـعەب) دوای ئـەوەی ماوەیـەك لای ئیمانـدارەكانی (مەدینـە) مایەوە، گەڕایەوە شاری (مەككە) و لای پێغەمبـەری (صـلی الله علیـە وسـلم) بـە پێغەمبـەری (صـلی الله علیـە وسـلم) راگەیانـد كـەوا ئیماندارەكانی شاری مەدینە دەیانەوێت چاویان بە پێغەمبـەر (صـلی الله علیە وسلم) بكـەوێت، لـەكاتی حەجـدا. (كـچەكانی پێغەمبـەر) زۆر دڵیان خۆش بوو، بەوەی كۆمەڵە كەسێك لە (مەدینـە) هاتوونەتـە نـاو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە. چونكە ئەو كاتـە سـەرەتای ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام بـوو، ژمـارەی موسـڵمانان زۆر كـەم بـوون و لــە ئـازارو ئەشـكەنجەدا دەژیـان بەدەسـت كافرەكـان ، ژیـان و دونیایـان زۆر لێ تەسك ببۆوە، جا تاكە كەسێكیش كە موسڵمان دەبوو، بۆ موسـڵمانان دڵنەوایی و سـەرفرازی بـوو، چ جـای ژمارەیـەك لــە شـارێكی تـردا موسڵمان بن، دەرگای شارێكی تریان بۆ والا بووەو پـشتیوانیان زیـاتر بوو، كەواتە دەتوانن ئازارو ئەشكەنجە جێ بهێڵن و بچن بۆ ئـەوێ كـە شارێكی نزیكی شارەكەی خۆیانە، هەر وایـش بـوو، دواتـر پێغەمبـەرو (صلی الله علیە وسـلم) و موسـڵمانان شـاری ( مەككـە ) یـان جـێ هێشت و چوون بۆ ( مەدینـە). لـە( مەدینـە) ئیـسلام گەشـەی زۆری كرد،موسڵمانان توانیان لەوێ دەوڵەت دروست بكەن و هەناسەیەكی بەختەوەری بكێشن ، جا بۆیە( فاتیمـە) و خوشـكەكانی زۆر دڵخـۆش بوون، بـە تایبـەت كـە باوكیـشیان زۆر دڵخۆشـە جـا كـچێكی وەك

(فاتیمه) ( رەزای خودای لەسەر بێت) پەروەردەی ئەو باوکە مەزن وبەرێزە بێت دەبێ چ جۆرە ئەخلاق وتێگەیشتن ودیدێکی هەبێت بۆ رووداو پێشبینیەکان، لەبەرئەوەی ئەو کاتە ژمارەی موسڵمان کەم بوو، تەنها لەشاری مەککەش بوون، جا چەند کەسێك موسڵمان ببن بەتایبەتی لەشارێکی تردا، پشتیوانی بوونێکی باشە بۆ بانگەوازی ئیسلامی، لەکاتێك بیانەوێ ئەم شارە پڕ لەستەمکارە یە جێبهێڵن و بچنە شارێکی تر، کە موسڵمانی خاوەن هەڵوێست و خودا ویستی لێ یە ، بۆ ئەوان جێگای حەوانەوەیە.

بەتایبەت هەوڵ وکۆشش کردن لەپێناو ئاینێکدا کە ئاینی خودای پەروەدگارە و هەر خۆیشی پارێزگاری لێ دەکات.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الإِسْلَامُ﴾(آل عمران:١٩) واتە: ((بە راستی دین و ئاینی پەسند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە)).

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت:﴿ وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنْ الْخَاسِرِينَ(٨٥)﴾(آل عمران) واتە: جا ئەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات، لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە.

کاتێ موسڵمانەکان لە ( مەککە ) وە بۆ (مەدینـە) کۆچـیان کـرد هەندێك لە قورێشیەکان ئازاری (فاتیمەو ئوم کەلـسوم)یانـدا، یـەکێك لەوان (الحویرث بن نقیذ)بو رۆوو، کە لەسەر حوشترەکانیان (فاتیمـەو ئوم کەلـسوم)ی فرێدایە خوارەوەو بەسەر زەوی کەوتن.

خودای گەورە رق وتوڕیی لەم پیاوە گرت.

دواتر (فاتیمە و ئـوم کەلـسوم) گەیـشتنە باوکیـان و ئەبوبـەکری هاوەڵی، ئەوانیش پێشوازیان لێ کردن. دەبێ لێرانە شـتێك بێنینـە بـەر چاومان ئـەویش هەڵوێـستی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) وەك سەرکردە بیری دەکردەوە وئەوهاش هەنگاوی دەهاویـشت ئەگـەر نـا چـۆن کـچەکانی لـە مەککـە بـەجێ دەهێڵـێ لـە ژێـر دەسـتی ئـەو هاوەڵدانەرو ستەمکارانە، بەڵام بۆ پێغەمبەر (صـلی الله علیـه وسـلم) هەموو ئیمانداران منداڵ وکچی ئەون.

(الحویرث) پیاوێکی پـیس وسـتەمکار بـوو، (الـبلاذري) دەڵێـت: کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە (مەککە) بوو، ئـەم کـافرە (الحویرث) زۆر قسەی ناشیرین و نارێکی بە پێغەمبەر (صـلی الله علیـه وسلـم) دەوت و ئازاری دەدا، لەرۆژی رزگارکردنی شاری (مەککـە) (الحویرث) هەلات و لە (مەککە) چووە دەرێ، (ئیمامی عەلی) کەوتـە دوای تاکو کوشتی.

پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسـلم) لـەکاتی رزگـارکردنی شـاری (مەککـە)دا فـەرمانی دا شـەش (٦) کـەس بکـوژن، یـەکێك لەوانـە (الحویرث) بوو.

## شوکردنی (فاتیمە)

ئیمامی تەبەری لە کتێبـی (ذخـائر الـصبا في مناقـب ذوي القربـی) دەفەرموێت: لە (ئەنەس کوڕی مالیك) ( رەزای خوای لەسەر بێـت)، گوێی لێ بوو فەرموویەتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ((خودای گەورە لە رێگای جوبرِائیلـەوە فـەرمانی پێکـردووم، کـە ( فاتیمە) لە (عەلی ) مارەبکـەم)). ئـەو کـات تەمـەنی فاتیمـە ١٨ سـاڵ بووە. وە لە ریوایەتێکی ترهاتووە دەڵێ :ئـەو کاتـەی (فاتیمـە) شـوی کرد تەمەنی (١٥)ساڵ و(٥)مانگ بوو ،وە عەلی هاوسـەری تەمـەنی ( ٢٩) و(٥ )مانگ بوو.وە شوکردنەکەی دوای شەڕی (ئوحد) بوو.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بـە( ئەنەسـی کـوڕی مالیـك )ی فەرموو: (( بڕۆ ئەو هاوەڵانەم بۆ بانگ بکـە (ئـەبو بـەکری صـدیق)و (عومەری کوڕی خەتاب) و (عوسمانی کـوڕی عـەفان) و (عبـدالرحمن کوڕی عەوف) (تەلحـە) و (زوبـەیر)، )) (عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب) لـــەوێ نـــەبوو، بۆیـــە پێغەمبـــەر (صـــلی الله علیـــە وســـلم) فەرمووی:((خودای گەورە فەرمانی پێکردووم کە ( فاتیمە ) بـدەم بـە

(عەلی)و مارەییەکەی (٤٠٠) مسقاڵ زیو بێت، ئەگەر عەلی رازی بێت)) لەدواییدا ئیمامی عەلی هاتەوەو پێکەنی، پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) پێکەنی و فەرمووی: (فاتیمە)ت لێ مارە دەکەم بە (٤٠٠) مسقاڵ زیو، ئەگەر رازی بێت؟))

ئەوە بوو(ئیمامی عەلی) رازی بوو. ئەم خوازبێنی و مارەکردنە لە ساڵی دووەمی کۆچی بوو، لەدوای جەنگی بەدر.

ئیمامی عەلی (رەزای خوای لەسەربێت) خۆشی ئەم رووداوی مارەکردنە دەگێڕێتەوە. دەڵێت: فاتیمە لەلایەن پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دیاری کرا، خزمەتکارێکم وتی: ئەزانی فاتیمە لەلایەن پێغەمبەری خوداوە دیاری کراوە؟ دەڵێ وتم: نەمزانیوە، وتی: بەڵێ دیاری کردووە، بۆ ناچێت بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) و داوای بکەیت، لێت مارە بکات، عەلی (رەزای خوای لەسەربێت) دەڵێت: وتم هیچ شتێکم هەیە، تا ژنی پێ بینم؟ ئەو خزمەتکارە وتی: کوڕە بڕۆ ئەگەر بچی ئەتداتێ، دەڵێ: وەڵاهی لەکۆڵم نەبۆوەو هەر داوای لێ دەکردم کە بڕۆم، تا رۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) لەبەردەستیدا دانیشتم و ئارەقەیەکی زۆرم کردو سوێند بەخوا لەبەر هەیبەتی هیچم بۆنەوترا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) پێی وتم: ((کارێکت هەبوو هاتی؟ پێویستی یەکت هەبوو؟)) منیش هەر بێ دەنگ بووم، فەرمووی:(( لەوانەیە بۆ

داواکردنی فاتیمه هاتبی؟)) وتم: بەڵێ، ئەویش فەرمووی: ((وهل عندك من شيءٍ تستحلها)) واتە: هیچت هەیە لە مارەییەکەیدا بیدەیت؟. وتم: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:(( ئەی ئەو درعەت چی لێهات کەدام پێت؟ سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەو درعە (٤٠٠) درهەم دەکات )).

وتم: ماومە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (( قد زوجتكما، فابعث اليها بها فاستحلها)) واتە: دەی لەسەر ئەو درعە مارەم بڕی بۆت و تۆش بۆی بنێرە، ئەوە مارەیی( فاتیمە)ی کچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) .

بوو. لە ریوایەتێکی شیعەکاندا هاتووە، کە ئیمامی عەلی (رەزای خوای لەسەربێت) فەرموویەتی: درعەکەم هەڵگرتوو بە مەبەستی فرۆشتنی رێگەی بازارم گرتە بەرو فرۆشتم بە (عوسمانی کوڕی عەفان) بە چوار سەد درهەم، کاتێ پارەکەی پێدام ودرعەکەی لێ وەرگرتم و پێی وتم: ئێستا من خاوەنی ئەو درعەم و تۆش خاوەنی پارەکەی ؟ وتم: بەڵێ، وتی: دەی ئەو درعە لەلایەن منەوە دیاری بێت بۆ تۆ، منیش پارەکەو درعەکەشم هێنایەوەو خستمە بەردەستی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئەوەی کە (عوسمان) لەگەڵی کردم بۆم باس کرد، ئەویش دوعای خێری بۆ کرد.

(بوخاری) و(ترمذی) له (عائیشه) دهگێڕنهوه: پێغهمبهر (صلی الله علیه وسلم) له ئافرەتان (فاتیمه)ی کچی زۆر خۆش دهویست و، لهپیاوانیش مێردی (فاتیمه) که (عهلی کوڕی ئهبو تالیب)بوو. ئیمامی (موسلیم) له (صهحیحه)کهیدا دهگێڕێتهوه کهوا (المسود بن حزمه) به پێغهمبهری (صلی الله علیه وسلم) راگهیاند کهوا (عهلی کوڕی ئهبو تالیب) کچی (ئهبو جههل)ی خواستووه، که فاتیمه ئهمهی بیست، هاته لای باوکی و وتی: میللهتهکهت دهڵێن:تۆ لهکچهکانت توڕه نابی؟ ئهوه (عهلی) کچی (ئهبو جههل)ی خواستووه، ئینجا پێغهمبهر (صلی الله علیه وسلم) به (ئیمامی عهلی) فهرموو: (( خودای گهوره کچی پێغهمبهر که نێردراوی خودایه لهگهڵ کچی (ئهبو جههل) که دووژمنی خوایه کۆناکاتهوهو، نابێ لهگهڵ یهکتر بن )).

بۆیه (عهلی کوڕی ئهبو تالیب) وازی لهکچی (ئهبو جههل) هێناو نهیکرده ههوێ ی فاتیمه ئهوهش لهبهر خودی ئهبوجههل بوو، نهوهك لهبهر ئهوهی ژن بهسهر کچهکهی دێنێت.

ترسی پێغهمبهر (صلی الله علیه وسلم)که (فاتیمه) بچێته ناو ئاگر.

جارێك پێغهمبهر (صلی الله علیه وسلم) دهچێته لای (فاتیمه)و دهبینێ کۆمهڵێك زێڕی لهدهستدایه، (فاتیمه) دهڵێ: عهلی بۆی کڕیوم.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)کاتێك گوێ ی لە قسەکانی (فاتیمە) بوو، فەرمووی: پێت خۆشە، پێت بڵێن کچی پێغەمبەر ئـاگری لەدەستدایە؟!

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دانەنیـشت و رۆیـشت. لەگـەڵ ئـەوەی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم)( فاتیمـە)ی زۆر خـۆش دەویست و زوو سەری لێدەداو لەلای دادەنیشت بەڵام ئـەم جارەیـان بەهۆی ئەم زێڕانەیەوە لای نەمایەوەو بە دڵ تەنگی لای رۆیشت.

دوای ئەوە( فاتیمە) زێڕەکانی فرۆشت و بەندەیەکی پێ ئازاد کرد. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: ((سوپاس بـۆ خـوا کـە خوای گەورە رزگاری کردی لە ئاگر)).

# گواستنەوەی فاتیمە

(ئەسمای کچی عومەیس ) دەڵێت: من لەئاهەنگی گواستنەوەی فاتیمەدا بەشداریم کردو لەبەیانی ئەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاتە بەر دەرگاکەو فەرمووی: (( یا أم أیمن ادعي لي أخي)) واتە: ئەی( ئوم ئەیمەن) براکەمم بۆ بانگ بکە، وتم: براتە کچی خۆتی ئەدەیتێ ؟

فەرمووی: ( بەڵێ )،(مەبەستی برای دینی بوو) پاشان فەرمووی: (فاتیمەم بۆ بانگ بکەن )، فاتیمەش هات، بەلاَم لەشەرماندا خەریك بوو بەلادا دەکەوت ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەندێ ئاوی پژاند بە دەم و چاوی (عەلی و فاتیمە) داو دوعای خێری بۆ کردن، وپاشان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوەو ڕەشاییەکی بەدی کرد، فەرمووی: ((ئەمە کێ یە؟ وتم: منم، فەرمووی: ئەسمای؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەسمای کچی عومەیس؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: بۆ زەماوەندی کچی پێغەمبەری خوا وەك ڕێزلێنان هاتوویت؟)) وتم: بەڵێ، ئەویش دوعای خێری بۆ کردم.

(ئیمامی عەلی) کاتێك چووە خواز بێنی فاتیمە (ڕەزای خودای لەسەر بێت) پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) زۆری پێ خۆش بوو، چونکە خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) خۆی (ئیمامی عەلی)

پەروەردە کردبوو، وەك منداڵەکانی خـۆی پـەروەردەی پێغەمبەرایـەتی وەرگرتبوو.

کاتێـك ئیمـامی عـەلی (رەزای خـوای لەسـەر بێـت) فاتیمـەی گواستەوە، هیچیان نەبوو، (جـابر) دەفـەرمووێت: لەشـەوی بـووك و زاوایەتی یاندا تەنها پێـستەی خۆشـکراوی بـەرانیان هـەبوو، لـەجیاتی دۆشەك. لە گەڵ ئەوەی کە فاتیمە (رەزای خودای لەسەر بێت) کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، بەڵام سەبارەت بە( فاتیمـە) بـۆ( ئیمامی عەلی) خێزانێکی سالیحەو خودا ناس بوو، بـە هـیچ شـێوەیەك شتێکی لیێ نەبینراوەو نەبیستراوە کە فیزی لەسەر پیاوەکەی لێدا بێـت لەگەڵ ئەوەی پیاوەکەی زۆر هەژار ودەست کـورت بـووە، (ئـەسمای کچی عومەیس) دەڵێ: جیازی (فاتیمە) تەنها یەك لێفە بوو ، خواردنی بووك وزاوایەتیان دەفرێك جۆو هەندێك خورما بوو.

## چێشتی رۆژی بووك گواستنەوە:

(بەریرە) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کـاتێ عـەلی (فاتیمـە)ی خواسـت، پێغەمبەری خـوا (صـلی الله علیـە وسـلم) فـەرمووی:((ژن خواسـتن دەبێت وەلیمەی بۆ بکرێت)) واتە: خواردن دروست بکرێت، سـەعد وتی: بەرانێك لەسەر من، کۆمەڵێك لە پشتیوانانیش برێك گەنمەشامیان ئامادەکرد، ئەو شەوەی کە( فاتیمە)ی تیادا دەگوازرایەوە، بـە( عـەلی) فەرموو: باسی هیچ مەکە تـا دەمبینیتـەوە. پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) داوای ئـاوی کـردو دەسـتنوێژی پـێ گـرت و ئـاوی دەستنوێژەکەشی پژانـد بـە دەم وچـاوی (عـەلی) داو پێـی فـەرموو: ( اللـهم بارك فیهما وبارك علیهما، وبـارك فی شـبلهما) واتـە : (خوایـە پیرۆزیان کەیت و پیرۆزیان بێت و نەوەکانیشیان پیرۆز بێت ).

## ژیان وگوزەرانیان

(هەناد) لە (عەتا) دەگێڕێتەوە، دەڵێت: پێیان وتووم کە عەلی ( رەزای خوای لەسەربێت )وتوویەتی: (چەند رۆژ من و( فاتیمە) ماینەوە کە هیچمان نەبوو بیخـۆین و پێغەمبـەریش (صـلی الله علیـە وسـلم) هیچی نـەبوو، لـەماڵ دەرچـووم و لـە رێگـا دینـارێکم دۆزی یـەوە، کەلەسەر رێگاکەم کەوتبوو، ماوەیەك وەسـتام بـەخۆمم دەووت: ئایـا

هەڵی گرم یان بەجێی بهێڵم؟ پاشان هەڵم گرت لەبەر وەزعی خراپی ژیانمان وبردم بۆ ئارد فرۆشەکان و ئاردم پێی کڕی و هێنامەوە، دام بە ( فاتیمە ) و پێم وت: بیشێلەو بیکە بە نان، ئەویش دەستی کرد بە هەویر شێلان، کە زۆر ماندوو هیلاك دیاربوو، پاشان کردی بە نان، منیش هاتم بۆ لای پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم) مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی:( بیخۆن ئەوە ڕۆزی یەکەو خوای (عز وجل) بۆی ناردوون ).

(شەعبی) دەڵێت: ئیمامی عەلی (ڕەزای خوا لەسەربێت) وتوویەتی: جارێك لە مەدینە زۆر زۆر برسیم بوو، چووم بۆ گەڕەکی سەرەوەی مەدینە تا ئیشێك بدۆزمەوە، بینیم وا ژنێك خۆڵی زۆری کۆکردۆتەوەو گومانم برد کە ئاوی دەوێت، بۆ شێلانی قوڕەکەی، چوومە لای و لەگەڵی ڕێك کەوتم کە هەر سەتڵێ ئاوی بۆ بهێنم بە دەنکێك خورما، شانزە سەفەرم بۆ هێنا تا وام لێهات دەستەکانم پۆقلەی کرد، پاشان دەستم شۆری و چووم بۆ لای و دەستم پیشاندا ئەویش (١٦) دەنکە خورمای دامێ، هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بۆم باسکرد، ئەویش لەگەڵمدا دەستی کرد بەخواردنی خورماکە.

# بانکردنیان بۆشەونوێژ

(ئیمامی عەلی و فاتیمە) لە ژیانێکی زۆر ناخۆشدا بوون، هەژاری تەنگەی پێ هەڵچنیبوون.( عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (رەزای خوای لەسەربێت )، دەگێڕێتەوەو دەڵێت: شەوێکیان من و ( فاتیمە) خەوتبووین و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بۆ ماڵمان ، خەبەری کردینەوە بۆ شەو نوێژو ، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو دەستی کرد بە شەونوێژ، دەڵێ: هەستی بە جموجۆڵمان نەکرد، بۆیە دووبارە هاتەوە بۆ لامان، هەڵی ستاندین وفەرمووی: ( قوما فصلیا )واتە: هەستن نوێژ بکەن.

منیش لەخەو هەستام و چاوم دەپروکاندو لەبەر خۆمەوە دەم وت: وەڵلاهی ئەتوانین ئەوەندە نوێژ بکەین کە بۆمان نووسراوەو دەروونەکانمان لە دەست خوادایەو گەر بیەوێت هەڵسین هەڵدەستین، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) پشتاوپشت گەڕایەوەو بەجێی هێشتین و دەستی دەکێشا بەڕانی خۆیداو دەی ووت: ( هەر ئەوەندەی نوێژ دەکەین کە بۆمان نووسراوە، هەر ئەوەندە نوێژ دەکەین کە بۆمان نووسراوە، ئەم ئایەتەشی دەخوێندەوە ((وکان الانسان أكثر شيءٍ جدلا)).

فاتیمە (رەزای خوای لەسەر بێت) ژیانێکی زۆر سادەو هەژارانەی هەبوو، لە ژیان وگوزەرانێکی زۆر ناخۆشدا دەژیار زۆر ماندوو بێ

تاقەت بوو، رۆژێکیان ئیمامی عەلی (فاتیمە) دەنێرێت بـۆ لای پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی خولامکارێکیان پێ بدات، ئەوانـەی لەجەنگ دەستگیرکراون، بۆ ئـەوەی لـە ئـیش و کـاردا یـار مـەتیان بدات. ( فاتیمە ) دەچێتە خزمەتی باوکی، بەلام شـەرم دەکـات داوای لێ بکات، دەگەڕێتەوە مالەوە، ئیمامی عەلی لێی دەپرسێ : چیت کرد؟ ئەویش دەلێت: وەلّلاهی شەرمم کرد باسی بکـەم. ئـەمجارە بەیەکـەوە دەچنە خزمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئیمامی عەلی داواکەی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) رادەگەیـەنێ، پێغەمبـەر (صـلی الله علیه وســلم) دەفـەرمووێ: (( وەلّلاهـی ناتانـدەمێ لـە وەختێکـدا ( ئەهلی صفە) ( دیلە بێ مالّ وحالّەکان بوون لە مزگـەوت دەخـەوتن) لـەبرسان سـکیان دەشێلن و شتێکیشمان نیە، سەرفی کەین بۆیـان..؟)) بە نائومێدی گەڕاینەوە مالّەوە

( عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (رەزای خوای لەسەربێت )، دەگێڕێتەوەو دەلێت: شەوێکیان من و ( فاتیمە) خەوتبووین و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەردانی کردین و هات بۆ مالّمان ،بینی لێفەیەکمان هەیە، ئەیدەین بەسەرماندا قاچمان دەردەکەوێت، ئەیدەین بەقاچماندا سەرمان دەردەکەوێت، هەر کە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بینی، هەستانەوە سەر پێ، شلّژاین و شەرم دایگرتین، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووین:( لەجێی خۆتان

مەجوولێن) پاشان پێی فەرموویین: (ئایا شتێکتان پێ بڵێم زۆر لەوە خێرو باشتر بێت کە داواتان لێکردم ؟) وتمان: بەڵێ. فەرمووی: (( لەدوای هەموو نوێژێك (١٠) جار (سبحان الله) و (١٠) جار (الحمدلله)و (١٠) جار (الله اكبر) بکەن و ئەگەر چوونە سەر جێگەی خەوتنیشتان (٣٣)جار (سبحان الله) و (٣٣) جار (الحمدلله)و (٣٣) جار (الله اكبر) بکەن )).

## چاکەکردنی فاتیمە لەگەڵ باوکی دا

(فاتیمە) ( ڕەزای خوای لەسەر بێت) زۆر باوکی خۆش دەویست و چاکەی لەگەڵدا دەکردو سۆزی بۆی هەبوو، چونکە کچی بچووکی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) بوو، وەك دەڵێن پاشە بەرە بوو، لای باوکی زۆر خۆشەویست وبەناز بوو، لە هەمان کاتدا هەر لە منداڵیەوە گوێ بیستی قورئان و ووتە بەرێزەکانی باوکی بوو، بۆیە لە نزیکەوە حاڵی بوو لەو چەمکانە، کە مرۆڤی لەسەر پەروەردەکراو دەوڵەتیان بەرێوە برد.

# لەیەکچوونی ( فاتیمە )و پێغەمبەر

(صلی الله علیە وسلم):

فاتیمە (ڕەزای خودای لەسەر بێت) لـە شـێوەو ئاکـاردا زۆر بـە باوکی دەچـوو. عائیـشە (ڕەزای خـودای لەسـەر بێـت) دەفـەرموێت کاتێك ( فاتیمە) دەرۆیشت ڕۆیشتنی وەك باوکی بوو.

(ئیمامی تەبەری) لە کتێبی (ذخائر العقبی) بۆمان دەگێڕێتـەوە، لـە حەزرەتی (عائیشە)وە (خوای لێی رازی بێت) کە دەڵێ: کەسم وەکـو پێغەمبەرو فاتیمە نەدیوە، لە قسەکردن و هەستان و دانیـشتن لـە یـەك بچن، کاتێ دەچوونە لای یەکتر یەکتریان ماچ دەکـردو لـەلای یـەکتر دادەنیشتن. لەکاتی ناخۆشیدا بۆ یەکتر دەگریان و دڵتەنگ دەبوون و، لەکاتی خۆشی و شادیدا پێدەکەنین وکامەران و بەختەوەر دەبوون

# فاتیمە لەگەڵ خەسوی دا

خەسوی ( فاتیمە) کە خێزانی (ئـەبو تالیـب ) و دایکـی ئیمـامی عەلی بوو، ئەویش (فاتیمەی کچی ئەسەدی کوڕی هاشم) بوو، یەکێك بوو لە صەحابیە بەرێزەکانی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) ئـەم ئافرەتە بەرێزە وەکو دایکێکی بەرێز بوو بۆ ( فاتیمە) ، جێگای دایکـی بـۆ گرتبـووەوە، نـەك هـەر بـۆ (فاتیمـە) بـەڵکو بـۆ خوشـکەکانی و

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) نموونەی سۆزو وەفاداری بوو بۆ هەموویان، هەردەم هاوکاری دەکردن، لەبەڕێوەبردنی ئیش وکارەکانیان و چاکەو وەفایەك بۆ ( فاتیمە و باوکی و خوشکەکانی) ، بەتایبەت لەدوای وەفاتی (ئەبو تالیب)ی مێردی، لەسەر وەسیەتی مێردەکەی لەماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مایەوە، بەوپەڕی توانا هەموو پێداویستی و کارەکانی بۆ ئەنجام دەدان، بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوە هات و بەو شێوەیە بوو بە یەکێ لەو ئافرەتانەی زۆر زوو هاتن بەدەم بانگەوازەوەو بوو بە یەکێك لەو خوشکە پێشینانەی لە ڕێبازی پاکیزەییدا هەڵکەوتن ، ساڵانێکی زۆر لە خزمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دابوو ، لەتەمەنی منداڵی و هەرزەکاری و لاویدا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە (٨) ساڵی تاکو (٢٥) ساڵی لای ئەو بوو، واتە تاکو خێزانی پێکهینا، جگە لە ساڵانی کۆتایی دوای مردنی (ئەبو تالیب)، لە خزمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و منداڵەکانی دابوو، بەتایبەتیش (فاتیمە) کە بووکی ئەو بوو.

لە ئیمامی عەلی یەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەگێڕنەوە کە دەڵێت: ( وتم بە دایکم تۆ بەس ئاو بێنەو پێداویستی ئامادە بکەو فاتیمەش هەویر شێلان و نان کردن لە ئەستۆ دەگرێت).(٢)

(ابن حجر) لە (الاصابة) کەیدا دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبو تالیب(ڕەزای خوا لەسەر بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلی الله

علیه وسلـم) پۆشاكێكی ڕەنگاوڕەنگی پێ بەخشیم و فـەرمووی پـێم:( اجعلها خمرا بين الفواطم ) واته:( بیكه بەچەند سەرپۆشـێك و لـەنێوان فاتیمەكاندا بەشی بكە) . منیش كردم بە چوار سەر پۆشـەوەو دانەیـەك بۆ ( فاتیمەی كچی پێغەمبەر) (صلی الله علیه وسلـم) ، دانەیەكی تر بۆ (فاتیمـەی كـچی ئەسـەد) (ڕەزای خـوا لەسـەر بێـت) واتـە دایكـی، دانەیـەكی بـۆ (فاتیمـەی كـچی هـەمزە) (ڕەزای خـوا لەسـەر بێـت) چوارەمی ناونەبرد.(٣)

ئەم ( فاتیمە ) (دایكی ئیمامی عەلی)چ لەكاتی ژیانیداو چ لـەكاتی ساتەوەختی مردنیشیدا بەختێكی باشی هـەبوو، چـونكە ڕێـزی تایبـەتی هەبوو لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلـم) . (٤)

لــە (ئەنەسـی كـوڕی مالیـك)ەوە (ڕەزای خـوای لەسـەر بێـت) دەگێڕنەوە، كە وتوویەتی: كاتێ دایكی (عـەلی كـوڕی ئـەبو تالیـب)، (فاتیمەی كچی ئەسەد) كۆچی دوایی كرد، پێغەمبەر (صـلی الله علیـه وسلم) چووە سەر تەرمەكەی و فەرمووی : (( رحمك الله يا أمي، كنت أمي بعد أمي، تجوعين وتشبعيني، وتعـرين وتكـسيني، وتمـنعين نفـسك طيباً وتطعميني، تريدين بذلك وجه الله والدار الآخرة))(٥).

واتە: ( ڕەحمەتی خوات لێ بێت دایكی شیرینم، تـۆ دایـك بوویـت لەدوای دایكم، خۆت برسی دەكرد لە پێناو تێر كردنی منـداو خـۆت

بیّ بەرگ دەکرد لەپێناو پۆشتەکردنی منـدا، خۆشـیت لـەخۆت بـڕی بوو، بۆ من و ئەمەشت لەبەر خاتری ڕۆژی قیامەت دەکرد ).

سۆزو بەزەیی( بیلال) بۆ (فاتیمە) (رەزای خوای لەسەر بێت)

بیلال بەیانیەکیان لە نوێـژ دواکـەوت، پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسلم) پیّ فەرموو: بۆ دوا کەوتی؟!

لە وەلاّمدا بیلال ووتی: (فاتیمە نانی دەکـرد منداڵەکـەیم خـەریك کرد، تا ئیشەکەی کرد، لەبەر ئەوە دواکەوتم.

ناوی منداڵەکانی فاتیمە (رەزای خوا لەسەر بێت)

(اللیث بن سعد) دەڵێ: (فاتیمـە) لـە ئیمـام عـەلی ئـەم مندالاّنـەی هەبوو، لە کوڕان(حەسەن وحوسێن و موحسین) موحسین بـە منـداڵی وەفاتی کردو، لە کـچانیش(زەینـەب و ئـوم کەلـسوم و روقیـە)شـی هەبوو، (روقیە) بە منداڵی وەفاتی کردو، (زەینەب) پێش مێردکردنی و (ئوم کەلـسوم) شووی کرد بـە ئیمـامی عومـەر (رەزای خـوا لەسـەر بێت).

خۆشەویستی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلـم) بۆ(عەلی و فاتیمە)

ئیمامی عەلی لە پێغەمبەری (صلی الله علیە وسـلـم) پرسـی: منـت خۆشتر دەویّ یان فاتیمە؟

ئەویش لە وەلاّمدا فەرمووی: ( فاتیمە ) م لە تۆ خۆشـتر دەویّ و، تۆش لەپاش ئەو.

ئیمامی عومەر کوڕی خەتاب (خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرامبەر بە فاتیمە فەرمووی: ( دایك وباوكم فیدات بێت).

( دایكی سەلمە) (خوا لێی رازی بێت) دەگێڕێتەوە دەڵێت: خۆشەویسترین كەس لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فاتیمە بوو، لەدوای ئەویش ئیمامی عەلی بوو، لەلای خۆشەویست و بەڕێز بوون و، هەردوو كوڕە نازدارەكەی فاتیمەی زۆرلاخۆشەویست بوو (حەسەن وحوسێن) (رەزای خوایان لەسەر بێت).

## بانگكردنیان بۆ نوێژی بەیانی

(ئیمامی ئەحمەد) لە (ئەنەسی كوڕی مالیك)ەوە (رەزای خوایان لەسەر بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شەش مانگ بە پێش ماڵی فاتیمەدا هاتووچۆی مزگەوتی دەكردو دەچووە نوێژی بەیانی، كاتێك دەگەیشتە لای ماڵی ئەوان، دەیفەرموو: (خاوەن ماڵ نوێژ بكەن). ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا(٣٣)﴾(الاحزاب:٣٣).

واتە: چونكە بەڕاستی خوا تەنها دەیەوێت هەموو ناپاكی و ناسازی و نادروستیەك لە ئێوە دوور بخاتەوە ئەی خاوخێزانی ماڵی پێغەمبەر بە تەواوی پاكتان بكاتەوە، (دوور لە هەموو ناتەواوی و قسەو قسەلۆكێك).

# لەبارەی ( فاتیمە ) وە

(ئیمامی ئەبو نەعیم) لە کتێبی (الحلیة) لە (ئەنەسی کوڕی مالیك) بۆمان دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ( ما خیر النساء؟) .

ئیمامی عەلی تێگەیشت کە مەبەستی لە فاتیمەیە، بە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) ووت: ( فاتیمە ) یە.

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ( ئەو ئافرەتەی تەماشای پیاو ناکات و پیاویش تەماشایان ناکەن ).

ئیمامی عەلی فەرمووی: چونکە ( فاتیمە) ئەو ئافرەتەی بەشێکە لە تۆ.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ( بەڵێ بەشێکە لە من و ئافرەتێکی پاك و خاوێنەو کچی (خەجیجە) ی پاکە ( ڕەزای خوای لەسەر بێت).

رۆژێکیان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتەدەرەوەو دەستی ( فاتیمە )ی گرتبوو فەرمووی: (( من عرف هذه عرفها، ومن لم یعرفها فهي (فاطمة بنت محمد) وهي بضعة مني، وهي روحي التي بین جنبي من أذاها فقد آذاني ومن آذاني فقد آذى الله)).

واتە:(( هەر کەسێك ئەوە بناسێت ئەوە بەڕاستی ناسیویەتی، ئەگەر نەیناسێت ئەوە (فاتیمەی کچی موحەممەدە) ئەوە بەشێکە لە من، ئەوە

دڵمه ، ئەوە روحمەو نیوەی لەشمە، هەرکەسێك ئازاری بدات ئەوە ئازاری منی داوە، هەر کەسێکیش ئازاری من بدات ئازاری خودای داوە)).

خۆشەویستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەموو ئیماندارانی خۆش دەویست و ڕێزی گشت خەڵکی دەگرت.

چ جای منداڵی خۆی یاخود منداڵی کچەکانی. منداڵەکانی ( فاتیمە ) ی زۆر خۆش دەویست بەتایبەت (حەسەن وحوسێن) زیاتر لە باوەشی دەکردن، یاخود لەسەر پشتی خۆی دایدەنان یاری لەگەڵ دەکردن، لەگەڵ پێکەنین و بە دڵخۆشی ئەوان ئەویش دڵخۆش دەبوو.

جارێکیان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتاری بۆ موسڵمانان دەدا، بینی (حەسەن) (خوا لێی رازی بێت) بە جلو بەرگێکی سوور دەڕواو ساتمە دەکات. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئارامی بۆی نەماو وتارەکەی بڕی و لەسەر مینبەر هاتەخوارەوە چوو (حەسەن)ی لەباوەش کردو بە دەستە پیرۆزەکانی گرتبووی و دەیفەرموو: ( خوای گەورە راستی فەرمووە) : ﴿أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلاَدُكُمْ فِتْنَةٌ﴾(الانفال:٢٨).

# خێزانی پاك و بەختەوەر

ماڵی( ئیمامی عەلی و فاتیمە) ماڵێکی پڕبوو لە خۆشەویستی و خووڕەوشتی بەرزو سۆزو بەزەیی و بەختەوەری، بەدوای سەروەت وسامانی دنیا نەکەوتبوون، بەڵکو ئەوان خۆیان بەخودا فرۆشتبوو، ژیانیان لەسەر بەرنامەی خودا ڕێك خستبوو لەسەر ئەو بەرنامە پیرۆزەیی قورئان و رەوشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەچرای ڕێزنان و پاك و بەختەوەری ماڵەکەیان روونـاك کردبۆوە خوای گەورەش لەبارەیانەوە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا(٣٣)﴾(الأحزاب:٣٣).

واتە: چونکە بەراستی خوا ،تەنها دەیەوێت هەمووناپاکی وناسازی ونادروستی یەك لەئێوە دووربخاتەوە ،ئەی خاوخێزانی ماڵی پێغەمبەربەتەواوی پاکتان بکاتەوە .

ئەو خۆشی وبەختەوەری ئەوان لەو ئایینە پیرۆزەی ئیسلام سەرچاوەی گرتبوو، ئەوان دوور بوون لە دونیا پەرستی و خۆویستی و دەست وداوێن پیسی، کە خەڵکانی تر بەدەستی یەوە گرفتارن.

فاتیمە خۆشەویسترین کەس بوو، لەلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو کاتانەی لای باوکی بوو، دڵی زۆر خۆش بوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زۆر خۆشی دەویست و سۆزو بەزەییەکی تایبەتی هەبوو بۆی، زۆر بە رەحم بوو لەگەڵیدا بۆیە زۆر جاران بە دایکی باوکی بانگی دەکرد.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سۆزو بەزەیی زۆربوو بۆ هەموو خەڵکی و بۆ منداڵەکانی گەلێك زیاتر، لەدوای وەفاتکردنی(خەدیجە). پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نازێکی زۆری ( فاتیمە)ی دەکێشا . فاتیمە لەکاتی وەفاتکردنی باوکی دا زۆر بێ تاقەت بوو، چونکە جارێکی تر سەبارەت بەو دایك وباوکی کۆچیان کردووەو لەدنیادا نایان بینێتەوە.

(ئیمامی عەلی) و (ئیمامی عەباس) نوێژیان لەسەر کرد.

رۆژێکیان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەچێتەماڵی( فاتیمە )بە سەردانی،( ئیمامی عەلی) لەماڵ نەبینی، بە (فاتیمە) ی فەرموو: (أين إبن عمك؟) واتە: (کوڕی مامت لەکوێ یە؟).

فاتیمەش لە وەڵامدا وتی: ناکۆکی کەوتە نێوان من و ئەو، تووڕەی کردم و خۆیشی لەماڵ دەرچوو، لێرە نەمایەوە. پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەکەسێکی ووت:(أنظر أين هو؟). واتە:(ئا بزانە لە کوێ یە؟) کەسەکەش چوو وهاتەوە، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مزگەوت راکشاوە. پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) رۆیشت بۆ لای و بینی راکشاوەو عەباکەی لەسەر شان کەوتۆتە خوارەوەو خۆڵاوی بووە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستی پێداهێناو دایتەکاندو گوتی: (قم أبا تراب) واتە: ( هەستە ئەی خۆڵاوی). هەر بۆیە (ئیمامی عەلی) ناوی (ئەبو توراب)ی زۆر پێ خۆشبووە.

# وەفاتی فاتیمە

دوای وەفاتی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بە شەش مانگ( فاتیمە ) کۆچی دوایی کرد، لە دووی رەمەزانی یازدەی کۆچی. وەلە ( موحەمەدی کوڕی عەبدولاّ )گێڕدراوەتەوە : ئەوکاتەی ( فاتیمە ) وەفاتی کرد ، شەو بوو ،لەمانگی رەمەزان بوو،تەمەنیشی ( ٢٩ ) ساڵ و چەند مانگێك بوو، وە لەریوایەتێکی تر هاتووە ، تەمەنی ( ٣٠ ) ساڵ بووە . عەلی هاوسەری لابوو لەگەڵ ( ئەسمای کچی عومەیس ) عەلی بە ئیشارە ووتی : هەر بەو شەوە دەیشارینەوە ، ( عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ) نوێژی لەسەر کرد ،لەکاتی بەخاك سپاردنی عەلی وعەباسی مامی لەناوگۆڕ وەریانگرت .

١- فضائل الصحابة. (٢/٦٨٥).

٢- مجمع الزوائد. ( ٩/٣٥٦ ) رجال السند رجال الصحيح.

٣- الاصابه ( ٨/٢٧ ) ژ ١١٥٣.

٤- أمير المؤمنين على بن ابى گالب. احمد رشيد ص ( ٢٤ ) ٥ السلسلة الضعيفة للئلباني ( ١/٢٣ ) ژمارە ( ٢٣ ).

## سوپاس ودەستخۆشی

● بۆبەڕێزان (عبداللطیف یاسین وحەویزعەلی ) کەئەرکی پێداچوونەوەیان لەئەستۆگرت .

● وە بەڕێزان ( اسماعیل خدر) و (نیزام حسن ) کە هاوکاری زۆریان کردم.

● بۆ( رادیۆی یەکگرتوو/دەنگی هەولێر) و(ماڵپەڕی پێغەمبەر)

● سوپاس بۆگشت ئەوخێرخوازانەی بۆ لەچاپدانی ، چاپی یەکەم بەشداریان کرد.

● وەسوپاس بۆگشت کارمەندانی چاپخانە چ لەچاپی یەکەم وچ لە چاپی دووەم بە شداریان تێیدا کردووە .

# سه رچاوه كان

* بەهەندێك دەستكاریەوە وەرگێڕدراوە لەكتێبی (نساء وبنات النبـي) رەزای خوایان لێ بێت، تألیف/ محمد راجي حسن كناس

**جگە لەم سەرچاوە سەرەكییە سودلەم سەرچاوانەی خوارەوەش وەرگیراوە:**

- تەفسیری ئاسان/ نوسینی: بورهان محمد امین.
- ژیانی بڕواداران (عەلی كوڕی ئەبوتالیب ) و (عوسمانی كوڕی عەفان ) نوسینی :دكتۆر عەلی محمد الصلابی / وەرگێڕانی :مامۆستا عومەر تۆفیق خەتاب .
- ژیانی پێغەمبەری مەزن/ نوسینی: شێخ محمد پارەزانی.
- ئەنتەرنێت.